
T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
A.} MKT.UM
345 | 24 | 1

A.}MKT.UM.00345.00024.001

<table>
<tr><td>A.MKT.UM.</td><td>00345.00024</td><td>7 جەمادی یەکەم 1274</td></tr>
<tr><td colspan="3">راگەیەندراوی بەندەیە<br>عەبدولغەفور ئەفەندی کە برادەری گەورەکانی شێخی قادریە جەنابی شێخ عەبدولرەحمان ئەفەندییە، لە لایەن جەنابی سەرداری واڵا و ئەنجوومەنی گەورەی ئەیالەتی بەغداد کۆتایی هێنان و خوێندنەوەی بریارنامەکەی دراوەتە دەستی بە فەرمانی سەروو ناوبراو بۆ هەندێك کاری خۆی و رێکخستنی کاری تایبەتی خۆی دەچێتە دەرسەعادەت، هەر خۆشی تا ئێستا لە قەزای کۆی سانجەقی سەر بە ئەیالەتی شارەزوور بوونی هەیە، لەسەر ئارەزووی پاشا دەروات، لەبەر ئەوەی ناوبراو برادەری شێخ عەبدولرەحمان ئەفەندیە شایەنی میهرەبانی و هاوکاریە، بە گوێرەی کۆتایی هێنان بە بابەتەکە و بە بریارنامەکە خاوەن هەقی خۆیەتی و شایەنی هاوکاریە، تکایە لەلایەن پاشای سەدارەتپەناهی هاوکاری بکرێت، لەم بابەتەدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>لە ٧ جەمادی یەکەم ١٢٧٤<br>موتەسەرفی ئەیالەتی شارەزوور بە مۆری ئیسماعیل بەگ</td></tr>
</table>




| I.MVL. | 00411.017896 | 3 جەمادی کۆتایی 1275 |
| --- | --- | --- |
| جەنابی ئەفەندم<br>لەسەر داوای ئەنجوومەنی والا بریارنامە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، ئەوەی لە بریارنامەکە روون بۆتەوە لە ئەیالەتی شارەزوور قەزای کۆی سانجەق لە دەروازەی گوندی پلنکان، لەلایەن هۆزەکانەوە قڵاکە رووخێنراوە و کاوڵ کراوە، لەبەر ئەوە بە بری خەرجی ٨١٥٠ قوروش نۆژەن کردنەوەی لە شوێن خۆی کۆتایی پێهاتووە، لەسەر گرنگی شوێنکەوتەی قەڵاکە برە خەرجی باسکراو لە شوێن خۆی بە کەمکردنەوە، دووبارە بونیادنانەوەی دووپاتکراوەتەوە، بۆ جێبەجێ کردنیشی لە بارەی حەواڵەکردنی بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە، بە هەر شێوەیەك بێت فەرمانی پاشای جەنابی ملوکانە چ بفەرموێت بە گوێرەی ئەو دەست بە کار دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو بە پەلە کرا ئەفەندم، ٣ جەمادی کۆتایی ١٢٧٥. | | |


OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (C)

i.MVL 419/18342

1

**İ.MVL.00419**

| | | |
|---|---|---|
| I.MVL. | 00419.018342 | 18 زیلقەعدە 1275 |

بـە تێروانیـن لـەم دوو راپۆرتـەی کـە لـە نەزارەتـی دارایـی جەلیلـە لـە مێـژووی ٣ زیلقەعـدە ١٢٧٥ حەواڵـەی ئەنجوومەنـی واڵا کـراوە، لـە دانیشـتوانی قـەزای کـۆی سـانجەق دەرویـش عوسـمان بەهـۆی مردنیـەوە مووچەکـەی کـە ١٧٠ قوروشـە بـێ خـاوەن ماوەتـەوە، لـەم مووچەیـە ١١٠ قـوروش بـۆ خانەدانـی کەرکـووك سـەعدوڵلا ئاغـا دابیـن بکرێـت، ٦٠ قوروشـەکەش بخرێتـە سـەر مووچـە کۆنەکـەی جەرجیـس ئەفەنـدی دانیشـتووی روانـدز، جێبەجـێ کردنـی ئـەم کارە دراوەتـە نەزارەتـی ناوهاتـوو لـە ئەنجوومەنـی واڵاش نـووسراوی بـۆ کـرا، لـەم بابەتـە ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ١٨ زیلقەعـدە ١٢٧٥.



A.}MKT.UM.00367.00081.002



A.}MKT.UM.00367.00081.003

| A.MKT.UM. | 00367.00081 | 26 سەفەر 1276 |
|---|---|---|

لە نـاو قـەزای كـۆی سـانجەق، كرسـتیانە كاتێـك ناموسـڵمانەكانی گونـدی شـەقڵاوە كچەكانیـان بـە شـوو دەدەن لەلایـەن بەگـی خۆشـناو مەحمـود بـەگ بـە زۆری پارەیـان لـێ وەردەگرێـت، بـۆ رێگەگرتـن و رێگەگرتـن لـە وەرگرتنی لـەم بابەتـە لەلایـەن رەشـید ئاغـا هـەواڵ نێـردراوە، دوای ئـەوەی فەرماننامـەی عالـی لـە ئەنجوومەنـی بەندەمـان كراوەتـەوە و خوێندراوەتـەوە، ئاغـای ناوبـراو چۆتـە گونـدی ناوهاتوو، لـەوێ تایەفەی باسـكراوی بینیوە، دوای پێشـنیار ئیـتر بـەدواوە بەڵێنـی داوە ئـەم جـۆرە كـردەوە جارێكـی تـر روو نەداتـەوە، لەلایـەن مەحمـود بەگـەوە سـەنەد دراوە، ئەگەرچـی ئـەم جـۆرە شـتانە روویـداوە، بـەڵام تـا ئێسـتا كەسـێكی ئـاوا رێـزدار و جەنابـی سـەردار تەشریفـی نەهێناوە خـودی خـۆی داوای نەكـردووە ئـەم كارە قەدەغـە بكرێـت، ئیـتر لەمـەودوا كاری لـەم جـۆرە دووبـارە نابێتـەوە، هێشـتا ئاغـای بەنـدە نەگەراوەتـەوە و ئـەو ووتانـەی رانەگەیانـدووە و بوێـری نەكردووە بریارنامە پێشـكەش بـكات، لەم بابەتە بـە هـەر شـێوەیەك بێـت ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو كەسـەیە كـە فەرمـان دەردەكات، لـە ١٧ موحـەرەم ١٢٧٦.
وەكیلی میللەتی یەهودی/ ئەندام بە مۆری عەبدولرەزاق/ ئەندام بە مۆری عەبدولغەفور بەندەخودا/ ئەندام بە مۆری سولەیمان/ ئەندام بە مۆری مەحمود/ ئەندام بە مۆری ئەبابەكر كوڕی عەبدوڵڵا/ ئەندام بە مۆری محەمەد ئەمین/ موفتی بە مۆری محەمەد ئەمین/ نائیب بە مۆری محەمەد حەسەن..../ بەرێوەبەری قەزای كۆی سانجەق بە مۆری زەینەل




A.}MKT.UM.00377.00018.001

<table>
<tr><th>A.MKT.UM.</th><th>00377.00018</th><th>13 رەبیعی کۆتایی 1276</th></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ والی بەغداد و نەزارەتی دارایی جەلیلە<br>لە ناو ئەیالەتی شارەزوور بەڕێوەبەری قەزای کۆی سانجەق عەبدولکەریم ئاغا لەبەر هەندێک کاری ناشەرعی و جموجۆڵی نەگونجاو دوور خراوەتەوە و لە شوێن ئەو بەو مووچەی کە هەیە بە وەکالەت زەینەل ئاغا وەکو بەڕێوەبەر دامەزرێت، بۆ ڕەزامەندی نووسراو و بریارنامە هاتووە دواتر حەواڵەی ئەنجوومەنی والا کراوە، ئەوەی باسکراوە بۆ بەڕێوەبەرایەتیەکە کارەکەی زەینەل ئاغا جێبەجێ بکرێت، هەروەها عەبدولکەریم ئاغا لەبەر کارە ناشەرعیەکانی پێویستە دادگایی بکرێت، هەرچی زووە بە بریارنامە بۆ ئەم لایەنە ئاماژەی پێکراوە و والا ئاگادارکراوەتەوە، بە ڕەزامەندی فەرمانی پاشای جەنابی پاشا لە ناو مەرکەز فەرمان دراوە، چۆنیەتی بەڕێوەبەرایەتیەکەش بە نەزارەتی دارایی جەلیلە ڕاگەیەندراوە، لە خۆچێی بە پێویست زانراوە دادگاییەکەی ئەنجام بدرێت، بۆ ئەمەش بە بریارنامە ئاماژە بۆ ئەم لایەنە نێردراوە.<br><br>بە نووسراو و بریارنامە ئاماژەی پێکراوە، لەسەر ئەم ئاماژە پێکردنە لە ئەنجوومەنی والا چەسپێنراوە، بە ڕەزامەندی فەرمانی پاشای جەنابی شاهنشا لە ناو مەرکەزدا هاتووە بە گوێرەی ڕەزامەندی بە جەنابی پاشای والی بەغداد ڕاگەیەندراوە، لە خەزینەش بۆ جێبەجێ کردنی هیممەت بکرێت، ١٣ ڕەبیعی کۆتایی ١٢٧٦.</td></tr>
</table>




| | | |
|---|---|---|
| A.MKT.UM. | 00387.00091 | 5 جەمادی کۆتایی 1276 |

قەزای کۆی سانجەق وەکو قەزای هەولێر لە شوێنە هەستیارەکانە و شوێنی کۆبوونەوەی هۆزەکانە، جگە لەمەش لەگەڵ ئێران سنوورە، بۆیە ئەو بەڕێوەبەرەی لەوێ ئامادە دەبێت، دەبێ کەسێکی لێهاتوو و بە توانا بێت، شارەزا بێت، قەزای ناوهاتوو لە رووی داهاتەوە داهاتێکی زۆری هەیە، دەبێت بە گوێرەی ویستی عالی هەڵسوکەوت بکات، ئەو کەسەی بۆ ئەو شوێنە دوورە هەڵدەبژێردرێت بە کێشە و گرفت نەبێت و بە ناچاری ئەرکەکە وەرنەگرێت، مووچەکەی کە لە ٣٠٠٠ قوروشە، بگەیەندرێتە ٤٠٠٠ قوروش یاخود کە بینرا کەسێکی بە توانا و شارەزایە و لە رووی نیزامەوە سەرکەوتووە و جموجۆڵی رێکوپێکە و جێگەی شایەد دانە، لەگەڵ ٢٠٠٠ قوروش مووچە لە بەڕێوەبەرایەتی قەزای ناوهاتوو دابمەزرێت، لەگەڵ فەرمانی عالی ئەو بابەتە پێشنیار کراوە. داهاتی ساڵانەی بە قوروش لە ٢١ رەبیعی یەکەم ١٢٧٥ پێشکەش کراوە، کراوەتە دەفتەر و بە فەرمانامە دووبارە داوای نووسراوی بە زانیاری کراوە، وەکو دانەی دووەم رێکخراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتە لە هەر حاڵەتێکدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، ٥ جەمادی کۆتایی ١٢٧٦.

| | | |
|---|---|---|
| پارەی سەربازیەکەیەتی | 007500 | 00 |
| باجەکەیەتی | 344162 | 06 |
| دە یەك (اعشاری) | 382507 | 20 |
| رسوماتەکەیەتی | 301000 | 00 |


OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI

i. MVL 423/18554

11

İ.MVL.00423

| 15 موحەررەم 1276 | 00423.018554 | I.MVL. |
| --- | --- | --- |

راگەیەندراوی بەندەیە

لە ناو ئەیالەتی شارەزوور بەڕێوەبەری قەزای کۆی سانجەق عەبدولکەریم ئاغا بەهۆی جموجۆڵی نەگونجاوی خەریکە دادگایی دەکرێت، بە دوور خستنەوەی لە شوێن ئەو زەینەل ئاغا بە وەکالەت ئەرکەکەی پێ دەدرێت، بە راگەیاندنی لەلایەن ئەنجوومەنی گەورەی ئەیالەتی ناوهاتوو بریارنامە ڕێکخراوە لەگەڵ جەنابی ئیسماعیل پاشای موتەسەرف نووسراوی هاتووە و هاوپێچ بەیەکەوە پێشکەش کراون، ئەو بریارنامەی کە باسکراوە لەگەڵ بابەتی نووسراوەکان ئاشکرا و روونە عەبدولکەریم ئاغا بەهۆی کردارەکانی دوورخراوەتەوە و دادگایی دەکرێت، بەهۆی دوورخستنەوەی زەینەل ئاغا لە بەڕێوەبەرایەتی ناوهاتوو دەست بەکار دەبێت و دادگایی کردنی ناوبراویش دەستبەسەر دەکرێت، لە کۆتاییدا چۆنیەتیەکەی رادەگەیەندرێت، بە فەرمانی وەکالەتپەناهی بریارنامە و نووسراوەکان لە بارەی زەینەل ئاغا بەهۆی رەسەنایەتیەکەی هاوکاری بکرێت و شایەنی کارەکەیە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

لە ١٥ موحەررەم ١٢٧٦

مۆری سەرداری ئەکرەم عومەر لوتفی


A.}MKT.DV.00185.00067.002

| 21 شەعبان 1277 | 00185.00067 | A.MKT.DV. |
|---|---|---|

راگەیەندراوی بەندەیە
لە خانەدانی دێرینی سانجەقی سلێمانیە بوومە، لە کۆی سانجەق قۆناغ و باغ و زەوییەکی کشتوکاڵی و ئاشێك نیوەی ئاو لە ژێر دەستی باپیرم بووە، بەڵام لەلایەن والی پێشووی بەغداد عەلی پاشا دەستی بەسەرداگیراوە، ئەمرۆ قۆناغەکە بۆتە قۆناغی حکوومەت و هەموو مولکەکەی تر کە باسکراوە لەلایەن میریەوە بەرێوەدەبردرێت، بەڵام یەك ئاقچە وەرناگرم، ئەمەش زوڵمێکی تەواوە لێم دەکرێت، پەرێشانم و بارودۆخم خراپە، جەنابی ملوکانە ئەو جۆرە زوڵمە بە گونجاو نازانێت، پشت بەستن بە میهرەبانی سەروو قۆناغ و باغ و چەند پارچە زەوی کشتوکاڵی و ئاش و هەموو داهاتەکان لە سندوقی دارایی بە سەنەد پێم بدرێت، یەك پارچە فەرماننامەی سەدری ئەعزەمی جەنابی سەدارەتپەناهی دراوەتە والی شارەزوور، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
٢١ شەعبان ١٢٧٧
عەبدولفەتاح کوڕی محەمەد بەگ




رواندز قائممقامنه



<table>
<tr><td>A.MKT.MHM.</td><td>00195.00095</td><td>7 رەبیعی یەکەم 1277</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ قائیمقامی رواندز<br>لە سانجەقەکانی رواندز و کۆی سانجەق بریار دراوە بە وەرگرتنی سەرباز و رسوماتی هەژماری مەڕوماڵات، خەریکە کارەکە ئەنجامی دەبێت، ئەو هیممەتەی کە کراوە، بۆ ئەمەش پێویستە موتەسەرفێك بنێردرێت، بۆیە سێ پارچە بریارنامە کە زانیاریەکانی دیارە نێردراوە، بۆ ئەم کارەش ئەوانەی خزمەتی باشیان کردووە و کارەکانیان دیارە و دڵسۆزن هەر یەکە بە وێنەیەك ناوەکانیان بۆ جەنابی پاشا بنێردرێت، بۆ ئەمەش پێویستە نووسراو لە سەرووەوە بێت.</td></tr>
</table>




| 22 رەبیعی کۆتایی 1277 | 00199.00042 | A.MKT.MHM. |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
لە قەزای کۆی سانجەق سەر بە ئەیالەتی شارەزوور بریار لە سەر فرۆشتنی مولکی میری دراوە، بە ڕێگەی زیادکردن بریار دراوە بچێتە سەر ناوی کەرکووکی ئیسماعیل بەگ و محەمەد ئەمین ئاغا، خانەکە بەرامبەر بە ٤٠٠٠ قوروش بە پۆستە نێردراوە، لە بارەی ڕێکخستن و ناردنی سەنەدەکانیش لە ئەنجوومەنی شارەزوور بریارنامە هاتووە، بە هاوپێچ سەنەدەکەش بە پۆستە دەنێردرێت، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



A.}MKT.NZD.00346.00034.001

| A.MKT.NZD. | 00346.00034 | 5 رەمەزان 1277 |
|---|---|---|

لەلایەن جەنابی راوێژکار بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
عەبدولغەفور ئەفەندی لە گەورە شێخەکانی نەقشبەندی لە قەزای کۆی سانجەق بە گوندەکانی ئینجاع، یانی و مادان ئەو تەکیەی کە خۆی تێدا پۆست نشینی بوو، خۆراکی تەکیەکەی پێ دابین دەکرا، بەڵام بە فەرمانی عەلی پاشا والی مردووی بەغداد بەرائەتی عالی باسکراو گۆردراوەتەوە، لەسەردەمی ناوبراوی مردوو بۆ خەزینەی دارایی جەلیلە نێردراوە، سەرەتا لەلایەن نەزارەتی جەلیلەی ناوهاتووەوە ئەو نووسراوەی کە تێدا داوای زانیاری دەکەن ناردوویەتی، لە وەڵامدا لە ٢٩ شەوال ١٢٧٤ بریارنامە راگەیەندراوە و ئاماژەی پێکراوە، بەڵام تا ئێستا جێبەجێ نەبووە، لە بارەی رێکخستنی ووتە و نیاز و وێنەی بریارنامەی باسکراوی بە واژوو لەگەڵ هەموو کاغەزەکان بەیەکەوە ئاشکرا کراوە، لە راستیدا بە شایەنی ئەوە دانراوە کە جێگەی میهرەبانی پاشا بێت، هەروەها لە زانا و بێ هاوتاکانە بۆیە لە جێبەجێ کردنی کارەکەی هیممەت بکرێت ئەمەشیان بە فەرمانی نەزارەتپەناهی جەلیلە دەبێت، لەم بارەیەوە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.




| 10 رەمەزان 1277 | 00347.00016 | A.MKT.NZD. |
| --- | --- | --- |

لەلایەنی عالی جەنابی راوێژکار بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
عەبدولغەفور ئەفەندی لە شێخە گەورەکانی نەقشبەندیەکانە، جەنابیان لە قەزای کۆی سانجەق گوندەکانی ئینجاغی گەورە و بانی و ماران لەلایەن والی بەغداد عەلی پاشا دراوەتە پۆست نشینی ناوبراو تا خۆراکی تەکیەی پێ دابین بکات، لەبەر ئەوەی بەرائەتی عالیەکەشی حەواڵە کراوە، لە سەردەمی ناوبراوی نەماودا بۆ خەزینەی دارایی جەلیلە رەوان کراوە، لەلایەن نەزارەتی جەلیلە ئیستیعلامنامە نێردراوە، لە وەڵامدا لە مێژووی ٢٩ شەوال ١٢٧٧ بریارنامە راگەیەندراوە و ئاماژەی پێکراوە، بەڵام هێشتا جێبەجێ نەکراوە، پشت بەستن بە نەریتەکان جێبەجێ کردنی بە هیممەتی نەزارەتپەناهی جەلیلەوە بووە، کە لە مێژووی ٢٨ شەعبان ١٢٧٧ نووسراوی بەندە راگەیەندراوە و نیاز کراوە، ئەمجارە ناوبراو ئەو نووسراوەی کە داویەتی هاوپێچ نێردراوەتە نەزارەتپەناهی، خۆشی شایەنی میهرەبانی پاشایە، لە زانایەکانە و بەپەلە کارەکە جێبەجێ بکرێت، لەم بابەتە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

نووسراوی شێخی ناوهاتوو لەگەڵ نەجیب پاشا و عومەر پاشا و مستەفا پاشا دوو پارچە نووسراویان داوە هەمووی بەیەکەوە لەگەڵ بریارنامەی ئەنجوومەن هاوپێچ نێردراوە.




A.}MKT.NZD.00353.00040.001

| A.MKT.NZD. | 00353.00040 | 11 زیلقەعدە 1277 |
|---|---|---|
| لەلایەنی جەنابی راوێژکارەوە بۆ نەزارەتی مەعاریفی گشتی جەلیله<br>لە زاناکانی قەزای کۆی سانجەقی ئەیالەتی شارەزوور، زیا ئەفەندی کیتابێکی بە ناوی (مقامات صوفیە و دقایق علمیە)ی شیکردۆتەوە، بەهۆی داواکردنی سەدری ئەعزەمەوە هاوپێچ بۆ جەنابی عالی ناردویەتی، ناوبراو لە زاناکانە و لەلایەکی تر لە دوعاکەرانە، بۆیە مووچەیەکی گونجاوی بۆ ببڕێتەوە، کتێبی باسکراو لە جەنابی سەدارەتپەناهی لەگەڵ پارچەیەك نووسراو بۆ سەروو نێردراوە، بۆ جێبەجێ کردنی ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات. | | |




<table>
<tr><td>A.MKT.NZD.</td><td>00356.00052</td><td>18 زیلحیجه 1277</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە<br>لە شێخەکانی نەقشبەندی و زانای کۆی سانجەق شێخ عەبدولغەفور ئەفەندی بە فەرمانی پاشا مانگانە ٣٠٠ قوروش مووچەی بۆ براوەتەوە، لەگەڵ ئەوەش بە بریارنامە ساڵانە بۆ خواردنی هەژارەکانی تەکیەکەی سێ تەغار خواردنی بۆ دابین دەکرێت، بەرائەتی عالی بۆ واڵا نێردراوە، بەمەبەستی جێبەجێ کردنی نووسراو کراوە تا هیممەت بکرێت.</td></tr>
</table>




| 28 موحەررەم 1278 | 00229.00091 | **A.MKT.MHM.** |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ئاوقافی هومایۆنی جەلیلە
٢٨ موحەررەم
لـە زاناکانـی قـەزای کـۆی سـانجەق سـەر بـە ئەیالەتـی شـارەزوور خەیالـی ئەفەنـدی لـە رووی سـۆفیگەریەوە بـە شـێوەیەکی گشـتگیر ئـەو کیتابـەی کـە ئامـادەی کـردووە، شـایانی وەرگرتنـی پلـەی حەرەمەینـە، لەلایـەن نەزارەتـی مەعاریفـی گشـتی جەلیلـە ئامـاژەی پێکـراوە، ١٥٠ قـوروش بـۆ ناوبـراو دابیـن بکرێـت، سـەبارەت بـۆ رەزامەنـدی وەرگرتـن، فەرمانـی پاشـای جەنابـی پاشـا دەربچێـت، فەرمانـی پاشـا جێبەجـێ دەکرێـت.

بۆ نەزارەتی مەعاریفی گشتی جەلیلە
لـە زاناکانـی شـارەزوور خەیالـی ئەفەنـدی کتێبـی پایەکانـی سـۆفی و وووریابوونی زانسـتی (مقامات صوفیـە و دقایق علمیـە) بـە شـێوەیەکی گشـتگیر شـی کردۆتـەوە، بـە ناردنـی کیتابەکـە لـە بـارەی وێنـەی رێزگرتنەکـەی دیسـان لـە ئاوقـاف ١٥٠ قـوروش کـە خاوەنـی نییـە، وەکـو مووچـە بـۆ ناوبـراو دابیـن دەکرێـت، دوای مۆڵـەت فەرمانـی پاشـای جەنابـی پاشـا فەرموویەتـی، لـە بـارەی دابینکردنەکە بـە نەزارەتی ئاوقافـی هومایۆنـی جەلیلە راگەیەنـدراوە.


T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
MVL
377 | 54

MVL.00377.00054.001

| MVL. | 00377.00054 | 9 زیلحیجه 1278 |
|---|---|---|

راگەیەندراوی داعیە

لە ئەیالەتی شارەزوور لە قەزای کۆی سانجەق ناحیەی بێتواتە موفتی باوکم بە بڵاوکردنەوەی زانست خەریك بووە و دوای مردنی مودەریس عەبدوڵلا ئەفەندی باوکم لە شوێنەکەی من دامەزراوم و جێگیر کراوم، بەڵام هەژارم و لەلایەکی تر هۆکارێك نییە تا بتوانم کارگێریەکەی بەرێوە ببەم، باوکم کە لە خەزینە ١٠ عولبە گەنم و ٧ عولبە و نیو جۆ و ٢٠ ریال ساڵانە وەریگرتووە، بۆیە داوا دەکەم بدرێتە من، لە شوێن خۆی ئەو بریارنامەیەی کە دەرچووە دراوەتە نەزارەتی دارایی، هەروەها بارودۆخی تەنگانەم بە داواکاریەکەم دەردەکەوێت لە چ بارودۆخێکم، بۆیە لەلایەن نەزارەتی ناوهاتووەوە بۆ بەندەی داعی مووچەیەکی دیاریکراوم بۆ بڕنەوە و بەڵێن دراوە کە لە کاتی بوونی مووچەی بێ خاوەن بۆ من دابین بکرێت، بۆ ئەمەش سێ ساڵە لە دەرسەعادەت چاوەڕێ دەکەم، بەڵام تا ئێستا هیچ ئەنجامێکی نەبووە، داعی بەندەتان جگە لە بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری هیچ کارێکی ترم نییە، خێزان و منداڵم برسی و کەم دەرامەتن و بێ خاوەن بەجێیانم هێشتووە، بۆ خوا و پێغەمبەر پاشای شاهانە بە بەزەیی و میهرەبانیەوە بە شایستەی بزانێت مووچەیەکم بۆ دابین بکات، فەرمانی پاشای ریاسەتپەناهی سەدەقە بفەرموێت لە هەر بارێکدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

بەندەی داعی مەحمود موفتی ناحیەی بێتواتە  قەزای کۆی سانجەق




| A.MKT.NZD. | 00379.00039 | 15 جەمادی یەکەم 1278 |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە<br>لە ئەیالەتی شارەزوور قەزاکانی کەرکووك و کۆی سانجەق و هەولێر، هەژمارکردنی ژمارەی سەرمەڕەکانی ساڵی ٧٦، رسوماتەکەی گەیشتۆتە ٧ یوك ٧٠٩٠٠٠ و هەندێك قوروش هەروەها لە قەزای کەرکووك بۆ رسوماتی هەژمارەی سەرمەڕەکانی هۆزی ئەلعوبێد و ئەبوفرج مەفرەج و ئەلغەریر، یەك پارچە نووسراو لەلایەن جەنابی پاشای قائیمقامی ئەیالەتی ناوهاتوو هاتووە و بۆ سەروو نێردراوە، بۆ جێبەجێ کردنی هیممەت بکرێت. | | |


A.}MKT.UM.00515.00038.002


A.}MKT.UM.00515.00038.001

| A.MKT.UM. | 00515.00038 | 8 جەمادی یەکەم 1278 |
|---|---|---|

- بۆ قائیمقامی شارەزوور جەنابی پاشا تەقیەددین
لـە دانیشـتوانی قـەزای کـۆی سـانجەق محەمـەد حەیـدەر ئەفەنـدی داواکاری پێشـکەش کـردووە، بەڕێوەبـەری قـەزای ناوهاتـوو زەینـەل ئاغـا بـە ناهـەق ١٥٠٠٠ قـوروش نرخـی گەنـم و جـۆی داواکـردووە و بردوویەتـی، بۆیـە داوای وەرگرتنـەوەی کـراوە، بـە زانیـاری شـەرعی شـەریف و ئەنجوومـەن لێکۆڵینـەوە و ووردبینـی کـراوە، بـە گوێـرەی ئـەو بارودۆخـەی کـە تێکەوتـووە، دەردەکەوێـت کارەکـە جێبەجـێ دەکرێـت، بـە بریارنامـە تایبـەت بـە ئاماژەکـە هیممـەت بکرێـت لـە نووسـینی نـوسراو.

- راگەیەندراوی بەندەیە
ئـەو بەندەیەتـان لـە کـۆی سـانجەقی سـەر بـە ئەیالەتـی شارەزوور، لە ناوچەی شـێخان نیشـتەجێیە، ئـەوەی ئەرکی سـەر شـانمە زەکاتـی مەڕومـاڵات لەگەڵ باج و رسـومات کە لەلایـەن میریەوە پێم سـپێردراوە کۆی بکەمـەوە، لە کاتی خـۆی بـە تەواوەتـی و لـە شـوێن خـۆی جێبەجێم کـرد، لـەم کاتـەدا بەڕێوەبەری کـۆی سـانجەق زەینەل ئاغـا ١٥٠٠٠ قـوروش نرخـی گەنـم و جـۆ دوای هەژمـار کردنـی بـە زۆری لەلای ئـەو بەندە بـێ دەسـەڵاتەتانەوە بۆ خۆی بـردووە، دوای ئـەوەی بـە تەواوەتـی مووچـەی کشـتوکاڵ و خێـزان و منداڵـمان بـرا، بـە ناچاری ئـەو هەموو ڕێگایەمـان بریوە، داوای میهرەبانـی و بەزەیـی دەکەیـن، داوا دەکەیـن پارەکەمـان بگەڕێندرێتـەوە، بـۆ ئـەم مەبەسـتە فەرمانـی پاشـای وەکالەتپەناهی میهرەبانی بفەرمووێت، لە هەر حاڵەتێك ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسـەیە کە خاوەن چاکەیە.
محەمەد حەیدەر بەگ






| A.MKT.UM. | 00517.00060 | 15 جەمادی یەکەم 1278 |
|---|---|---|

بۆ جەنابی قائیمقامی شارەزوور تەقیەددین پاشا
لە قەزای کۆی سانجەق، عەبدولغەفور ئەفەندی لە گەورە شێخەکانی تەریقەتی قادریە، بۆ هەژار و دەروێشەکانی تەکیەکەی لە ژێر ئاوی گوندی شوشکەی قەزای ناوهاتوو هەموو ساڵ برنج دەروێنێت، ئەم ساڵیش وەکو ساڵی پێشوو داوا دەکات هەمان کاری کشتوکاڵی بکات، هەروەها داوای کردووە زەکاتی سەر مەڕەکان بە ئەو بدرێت، هەر خۆشی لە زاناکان و دوعاکارانە، ئەوەی داوای کردووە دەکرێت جێبەجێ ببێت، بۆ ئەم مەبەستە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی نووسراوی سەروو.

به فەرمانی سەرووی جەنابی راوێژکار




| | | |
|---|---|---|
| 27 جەمادی کۆتایی 1278 | 00529.00092 | **A.MKT.UM.** |

راگەیەندراوی بەندەیە

ئەو بەندەیە لە ناو سانجەقی کەرکووک لە دانیشتوانی قەزای کۆی سانجەقە، لە خانەی ئاغای کەرکووک ٥ یوك دوخانم پارێزراوە، ئاوا باس دەکەن کە لە ژوورەوە تێك دەچێت و لەلایەن هەندێك کەسەوە وەکو ئەوەی خاوەنی بن دەستکاری دەکەن، لەم بارەیەوە غەدرم لێ دەکرێت، وەکیلەکەم لە ناو کەرکووك لەلایەن سلێمان ئەفەندی ژوورەکەم سەیر کراوە ئەو دوخانانەی کە هەیە فرۆشتویەتی، ئەو پارەیەی کە وەرگیراوە، بۆ ئێمەی ناردووە، رێگە لەو کەسانە بگیرێت کە دەڵێن ئەو کەلوپەلانە هی ئێمەیە، بۆ ئەم مەبەستە نیازی ئەوە دەکەم جەنابی موتەسەرفی شارەزوور تەقیەددین پاشا یەك پارچە فەرماننامە دەربکات، لە هەر حاڵەتێکدا ئەمر و فەرمان بۆ ئەفەندیمانە.

٢٧ جەمادی کۆتایی ١٢٧٨

بەندە ئەحمەد دوخانچی لە شارەزوور




| A.MKT.MHM. | 00259.00068 | 17 شەوال 1279 |
|---|---|---|
| بۆ لایەنی قائیمقامی سەر عەسکەر<br>لە ناو سانجەقی شارەزوور هەندێك شوێن لەگەڵ شارۆچکەی کۆی سانجەق تۆماری ناسنامە کۆتایی پێ هاتووە، ئەوانی تریش دەستی پێکردووە، والی بەغداد جەنابی پاشا تەلەگرافنامەی ناردووە لەگەڵ نووسراوی عالی سەر عەسکەر راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، فەرمانی پاشای جەنابی جیهان بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە لە پەراوێزی نووسراوە، داوای کردووە نووسراوی ناوهاتوو بنێردرێتەوە، ئەمر و فەرمانی ئەفەندیمانە. | | |




| | | |
|---|---|---|
| 19 زیلقەعدە 1279 | 00262.00092 | **A.MKT.MHM.** |

بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
ئـەم لیسـتەیەی پـارە کـە بـۆ تـاشرەکان نێـردراوە، لـە نـاو ئەیالەتـی شـارەزوور دانیشـتوانی کـۆی سـانجەق و لەلایەن ئـەو هۆزانـەی کـە بوونیـان هەیـە ٦٨٣٧٠ و لەلایـەن دانیشـتوانی سـانجەقی زەنگیـار ئەمجـارە ٤٨٥٠ قـوروش پارەیـان بەخشـیوە، کاغەزەکانـی دراوەتـە خەزینـە و پارەکـە بەخـشراوە، ئـەو ووتانـەی نێردراوەتـە نەزارەتـی جەلیلە، نووسراوەکانـی قائیمقامـی شـارەزوور جەنابـی پاشـا هاتـووە و هاوپێـچ بـۆ سـەدارەت نێـردراوە، ئـەو جـۆرە کاغـەزە باسـکراوانە لـە ڕێکخسـتنی ڕەسـەنی خۆیـدا کـەم کراوەتـەوە، لـە خەزینە جێبەجـێ کردن و بـە هەند وەرگرتنـی و لە بەرامبـەر کۆششـی دانیشـتووان وەڵام نووسراوەتەوە لەسـەر ئەمە فەرمان دراوە بـە ناردنەوەی نووسراوە نـاردراوەکان.


T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
MVL
400 | 64

MVL.00400.00064.001

| MVL. | 00400.00064 | 19 ڕەبیعی یەکەم 1279 |
|---|---|---|

جەنابی ئەفەندم
عەبدوڵڵا ئەفەندی موفتی ناحیەی بێتواتە سەر بە قەزای کۆی سانجەق کە باوکمە بەهۆی مردنیەوە ئەو داعیەتان لە ناحیەی ناوهاتوو وەکو موفتی دامەزراوم، لەلایەك مووچەیەکم نییە، هەروەها باوکی مردووم ئەو پارە و زەخیرەیەی کە ساڵانە بۆی دابین کرابوو، ئێستا بە میهرەبانیەوە بۆ داعی دابین بکرێت بۆ ئەمەش بریارنامەی خۆچێی پێشکەش کراوە، لە خەزینە وەڵام دراوەتەوە، دیسان بەهۆی ئەوەی مووچەکەی بێ خاوەنە، بۆ دابین کردنی مووچەی دیاریکراو داواکاریم پێشکەش کردووە تا بۆ من دابین بکرێت، داواکاریەکەم حەواڵەی بەیتوملال کراوە، ماوەی چوار ساڵە هیچ ئەنجامێکی نەبووە، ئەو داعیەتان خاوەن خێزان و منداڵە، ناتوانم لێرە بمێنمەوە و پەرێشانم، مادەم ئاوا بێهودە ماومەتەوە، پێویستم بە میهرەبانی سەرووە، بۆ ئێرە مووچەیەکی دیاریکراوم بۆ ببڕێتەوە، یاخود لە شوێن خۆی مووچەیەکی بێ خاوەن هەبێت وەکو مانگانەیەك بۆم دابین بکرێت، ئەم فەرمانە لە جەنابی نامق پاشا والی بەغداد بە ووتار بە یەك پارچە فەرماننامەی سەرۆکایەتی نووسراوەتەوە و نێردراوە، لەگەڵ ئەمەش ئەو خەرجی ڕێگایەش کە دابین دەکرێت، داعیتان لەگەڵ خێزان و منداڵەوە نزا و دوعای خێر بۆ جەنابی شاهانە و سەرۆکایەتی دەکات، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
داعی مەحمود موفتی بێتواتە




| A.MKT.MHM. | 00300.00004 | 4 زيلحيجه 1280 |
|---|---|---|

بۆ واليەتی بەغداد

پلـە بـە بەڕێوەبـەری کـۆی سـانجەق ئەحمـەد ئاغـا قەپوچـی باشـی دەرگای عالـی بدرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە دوای ڕەزامەنـدی جەنابـی پاشـا و بـە شـایان زانیـن جێبەجـێ دەکرێـت، ئـەوەی بـاس کـراوە لـە نیشـان و پلـەکان ئـەوا لـە پلـەی سـێیەم نیشـانی پـێ بدرێـت.

سەرعەسکەر


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)
OSMANLI ARŞİVİ
MVL
768 | 63

MVL.00768.00063.001

| MVL. | 00768.00063 | 21 جەمادی یەکەم 1280 |
|---|---|---|

بریارنامە
٥٣١
٢١ جەمادی یەکەم ١٢٨٠
پارچەیەك نووسراوی والی بەغداد جەنابی پاشا کە لە ١٥ جەمادی یەکەم ١٢٨٠ و ١٣ مایس ١٢٧٩ نێردراوە لە ئەنجوومەنی والآ حەواڵە کراوە، بەرێوەبەری قەزای کۆی سانجەق سەر بە سانجەقی شارەزوور سامی ئەفەندی ئەرکەکەی گواستۆتەوە بۆ نەزارەتی دوخان لە بەغداد، لە شوێن ئەو لە خانەدانی حەلەب ئەمین ئەفەندی کە لە کەرکوکە بە وەکالەت بە بەرێوەبەر دامەزراوە، لە بارەی رەسانەیەتی ئەوا پەسەند کراوە، هەروەها وێنەی ئاماژە پێکردنەکەی بە گوێرەی بەرژەوەندی دروستە، بە مووچەی ٣٠٠٠ قوروش کە بۆی دابینکراوە سەبارەت بە ئەمین ئەفەندی دەست بەکار دەبێت، لە خەزینەش کارەکە جێبەجێ کراوە، حەواڵەی نەزارەتی دارایی بووە، نووسراویش ئامادەیە.





MVL.00777.00026.001

<table>
<tr><td>MVL.</td><td>00777.00026</td><td>19 جەمادی یەکەم 1281</td></tr>
<tr><td colspan="3">لە لایەن جەنابی بە شەرەفی ریاسەتپەناهی بۆ نەزارەتی دارایی<br>لە قەزای کۆی سانجەق تەکیەی عەبدولرەزاق کوڕی ئەحمەد پۆست نشینەکەی عەبدولرەسول ئەفەندی مردووە، لەبەر خۆراکی رۆژانەی تەکیەکە هەر شێخێك بدۆزرێتەوە بە بەرائەتی عالیشانی پێی بدرێت و مانگانەش ١٥٠ قوروش بۆ کوڕی شێخ ئەحمەد ئەفەندی دابین بکرێت، لە والیەتی بەغداد نووسراو لە ئەنجوومەنی والاوە حەواڵەی ئەحکامی داد بووە، هاوپێچ لەگەڵ بریارنامەکە و بەرائەتەکەی بۆ عالی نێردراوە، ئاماژە بە جێبەجێ کردنی کراوە، ئەمر و فەرمانی ئەفەندیمانە.</td></tr>
</table>



A.}MKT.MHM.00335.00036.001

<table>
<tr><td>A.MKT.MHM.</td><td>00335.00036</td><td>23 موحەررەم 1282</td></tr>
<tr><td colspan="3">لە سانجەقی شارەزوور، محەمەد ئەفەندی زانای کۆی سانجەق بەهۆی مردنیەوە، ساڵانە ٢٥٠٠ قوروش بۆ مەدرەسەکەی لە ژێر دەسەڵاتی ئەودا بووە، ئێستا ماوەتەوە، لەلایەن میریەوە دەستی بەسەر داگیراوە، لە بەرامبەر ئەوەدا بۆ خۆراکی مەدرەسەی ناوهاتوو خەریکە دەکرێتە مەشروت کە مانگانە ٨٤ قوروش بۆ کوڕەکەی ساڵح ئەفەندی لە مەزرەعەی پلیکانە دابین بکرێت.</td></tr>
</table>




| MVL. | 00777.00072 | 11 سەفەر 1282 |
|---|---|---|
| پەراوێزی سەدری ئەعزەم بۆ نەزارەتی دارایی<br>بۆ ئەم کارە نووسراوی بەهیە حەواڵەی ئەحکامی دادی واڵا بووە و خوێندراوەتەوە، هەڵەکان لە خەزینە چاك کراوەتەوە، چۆنیەتیشی بە شوێن خۆی راگەیەندراوە، لە ئاماژەکان روون بۆتەوە، لەم حاڵەتەدا هیچ شتێك نەماوە کە لێکۆڵینەوە و ووردبینی بۆ بابەتەکە بکرێت، بەپەلە هەژمار کرا.<br><br>مووچەکانی قائیمقامەکانی سلێمانیە و رواندز و زنگیار لەگەڵ بەرێوەبەری کۆی سانجەق بە ووردبینی کردنیان هەڵەکان راست کرانەوە. | | |


I. MVL 561/25215

7

İ.MVL.00561

| 28 جەمادی یەکەم 1283 | 00561.025215 | I.MVL. |
| --- | --- | --- |

بۆ جەنابی ئەفەندم

لە بابەتی بریارنامەی ئەنجوومەنی والا کە راگەیەندراوە، لە ناو سانجەقی شارەزوور دانیشتووی شارۆچکەی کۆی سانجەق شێخ ئیبراهیم لە خانەکەی خۆی لەلایەن مەلا محەمەد کوژراوە، میراتگری کوژراو لێی خۆش نەبوونە، لە کاتی ئەنجامدانی قەساسیش ئەوا لە ناویان ئەگەر یەکێك لێی خۆش بێت یاخود سولح بکات، ئەوا لەم حاڵەتەدا قەساسەکە دەکەوێت، بە جێبەجێ کردنی شەرع بە گوێرەی یاسا بکوژی ناوهاتوو بە راگەیاندن و بریارنامە لەگەڵ ئاماژەی ئەو لایەنە بۆ شوێن خۆی دەنێردرێت، فەرمانی عالی و نووسراو نێردراوە، ئەگەرچی نووسراو نووسراوەتەوە، بەڵام لەم بابەتە ئەمر و فەرمانی جەنابی پاشا چ بفەرمووێت بە گوێرەی ئەو فەرمانە دەست بە کار دەکرێت، بۆ ئەمەش نووسراو نووسرایەوە ئەفەندم، لە ٢٨ جەمادی یەکەم ١٢٨٣.




<table dir="rtl">
<tr><td>I.MVL.</td><td>00571.025653</td><td>4 زیلحیجە 1283</td></tr>
<tr><td colspan="3">١٦٢٥<br>ڕاپۆرتی نەزارەتی دارایی جەلیلە لە مێژووی ٢٠ زیلقەعدە ١٢٨٣ و ١٥ مارت ١٢٨٣ حەواڵەی ئەنجوومەنی واڵا بووە، بابەتەکەی دیار و ڕوونە، لە ئەیالەتی شارەزوور لەسەر ئەو گیروگرفتەی کە چەتەیەک بە ناوی حەمەی کۆی سانجەق لەگەڵ هاوکارانی دروستیان کردووە، سەربازی نیزامیە و نەفەری فەرمانبەر ڕۆیشتوون، ٣٢٦٧ قوروش خەرجیان لەلا بووە، لە کاتی شەڕدا لەلایەن چەتەکانەوە بردراوە، ئەو کەلوپەلانەی کڕین و فرۆشتنیان پێکراوە، لە کاتی ناردنی هەشت یەکی داهاتەکە ٣٢٠٠ قوروشە، ڕێگە دراوە خەرجی ناوهاتوو لەوە هەژمار بکرێت، سەربازی ناوهاتوو ناردنیان و ڕێکخستنیان بۆ ڕێگەگرتنی چەتەکان بووە، لەو ڕێگەیەوە ئەو خەرجیە پێویستە بدرێت، ئەگەر بێتو لەو پارەی کە خەرجکراوە و تاڵان کراوە لەسەر ئەوان تۆمار بکرێت و هەژمار بکرێت مانای ئەوە دەگەیەنێ کە خەزینە هیچ شتێکی پێ نەداون، بۆ یەکلایی کردنەوەی ئەم کارە نووسراو حەواڵەی نەزارەتی ناوهاتوو کراوە، بەڵام لەم بابەتە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٤ زیلحیجە ١٢٨٣ و لە ٢٨ مارت ١٢٨٣.</td></tr>
</table>




A.}MKT.MHM.00414.00023.001

| | | |
|---|---|---|
| A.MKT.MHM. | 00414.00023 | 29 ڕەبیعی یەکەم 1285 |

دارایی

لە دانیشتوانی کۆی سانجەق ئەحمەد ئەفەندی بە مەبەستی چاوپێخشاندنەوە هاتۆتە ئێرە، بۆ خەرجکردنی خەرجی ڕێگا، ١٥٠٠ قوروشی پێ بدرێت، بۆ ئەمەش دوای ڕەزامەندی بە فەرمانی میهرەبانی جەنابی پاشا بفەرمووێت، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



| 21 جەمادی یەکەم 1285 | 03221.00010 | ŞD. |
|---|---|---|

٢١ جەمادی یەکەم ١٢٨٥
لەلایەن جەنابی ریاسەتپەناهی بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
عەبدولفەتاح لە قەزای کۆی سانجەق سەر بە سانجەقی شارەزوور لە دەرەوە و ناوەوەی دەژیت، پێشەکی لەلایەن میریەوە مولکەکەی دەستبەسەر کراوە، لە بەرامبەر ئەوەدا ٢٥٠ قوروش مووچەی پێ دەدرێت، رابگەیەنێت ئەم مووچەیە بۆ بەرێوەبردنی بژێوی خۆی گونجاوە، یا لە رقان داواکاری پێشکەش بکات و مولکەکەی رەت بکاتەوە لە شورای دەوڵەت حەواڵەی فەرمانگەی دارایی دەکرێت، لەسەر ئەو داواکاریە رەوانەی لای سەدری ئەعزەمی نەزارەتپەناهی دەکرێت، بە تێروانین لە داواکاریەکەی جێبەجێ بکرێت و خوێندنەوەی عالی ئاماژەی پێ بکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.




محاکمه جزائیه دائره سندن
٦٨٣

i.mms-48/2046

İ.MMS.0048

| | | |
|---|---|---|
| I.MMS. | 0048.002046 | 11 رەجەب 1290 |

لە فەرمانگەی دادگاییەکانی سزا
٦٨٣
لە ناو سانجەقی شارەزوور لە خانەدانەکانی قەزای کۆی سانجەق مەحمود ئاغازادە حەمە ئاغا بە سزای هەتاهەتایەی سەوڵ لێدان سزا دراوە، ماوەی ١١ ساڵە لە زیندانە، داواکاری پێشکەش کردووە تا ببوردرێت و ئازاد بکرێت، بە خۆی لە خانەدانەکانە بۆیە بە شایەنی خۆی دەزانێت میهرەبانی پاشا بیگرێتەوە، ئەو بریارنامەیەی کە لە ١٧ جەمادی کۆتایی ١٢٨٩ ژمارە ٨٣ لە ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەتی بەغداد رێکخراوە و پێشکەش کراوە لەگەڵ نووسراوی سزاکەی کە بە سزای هەتاهەتایەی سەوڵ لێدان لە مێژووی ٧ زیلقەعدە ١٢٨٩ ژمارە ١٥١ دەرچووە و تەلەگرافی حەمە ئاغا دەرچووە هەمووی بەیەکەوە حەواڵەی دیوانی ئەحکامی داد کراوە، لە فەرمانگەی دادگاکانی سزاش خوێندنەوەی بۆ کراوە و تۆمارەکان پێداچوونەوەی بۆ کراوە، حەمە ئاغا لەگەڵ هاوەڵانی کە ناویان دیارە کچی مەحمود سەرۆکی بەقاڵان بە ناوی کسکەیی شیخە بردوویانەتە خانەی یەکێکیان و بە هاوەڵانی کوشتویەتی، دواتر لەگەڵ هاوەڵانی رێگەی چەتەیی گرتۆتە بەر و کەلوپەل و پارەوپولی تاڵان کردووە، لەبەر ئەوەی واز لە چەتەگەریش ناهێنێ، بە ماددەی یاسایی ٦٢ بە سزای هەتاهەتایەی سەوڵ لێدان سزا دراوە، لە فەرمانگەی ناوهاتوو بریارنامە لە مێژووی ٤ جەمادی یەکەم ١٢٨٦ رێکخراوە و پێشکەش کراوە، بە گوێرەی ئەو بریارنامەیە سزاکەی جێبەجێ کراوە، لەم بابەتە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ١١ رەجەب ١٢٩٠ و لە ٢٢ ئۆغستۆس ١٢٨٩
دیوانی ئەحکامی داد




| | | |
|---|---|---|
| 22 رەجەب 1290 | 00463.00101 | **A.MKT.MHM.** |

٢٢ رەجەب ١٢٩٠
بۆ ویلایەتی بەغدادی جەلیلە
لە ناو سانجەقی شارەزوور مەحمود ئاغا زادە حەمە ئاغا لە خانەدان زادەکانی قەزای کۆی سانجەقە و بە سزای سەوڵ لێدانی هەتاهەتایە زیندانی کراوە، ماوەی ١١ ساڵە لە زیندانە، بۆ ئەمەش داواکراوە کە ناوبراو بەر لێبووردن بکەوێت، لە ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەتی بەغداد بریارنامە لە بارەی ناوبراو رێکخراوە، لەگەڵ بریارنامەکە نووسراوی گۆرینی سزاکەی بۆ سزای کاتی کە لە پایەی ویلایەت نێردراوە هەروەها لەلای ئاغای ناوهاتووش تەلەگرافنامە دەرچووە، هاوپێچ پشت بەستن بەم نووسراوانە، نووسراو لە دیوانی بریاری دادوەری دراوەتە قەڵەم، لە ئەنجوومەنی تایبەتی بریکارەکان خوێندراوەتەوە، بە تێروانین لەم بابەتە حەمە ئاغا لەگەڵ ئەو هاوەڵانەی کە ناویان هاتووە، سەرۆکی بەقاڵان کچی مەحمود بەناوی کسکەیی شێخە بردویەتیە خانەیەك دوای ئەوەی بە هاوەڵەکانی کوشتویەتی، لەگەڵ هاوەڵەکانی کاری چەتەیان کردووە و بوێری ئەوەیان کردووە کەلوپەل تالان بکەن، بە گوێرەی ماددەی یاسایی بە سزای سەوڵ لێدان زیندانی هەتاهەتاییان بەسەر سەپێنراوە، بریارنامەی لە مێژووی ٤ جەمادی کۆتایی ١٢٨٣ رێکخراوە، بە تێروانین لەم حاڵەتە و بە ئاماژەی پێشووی خۆچێی ئەم بریارە لە سەرەوە دراوە، سەر لە نوێ خوێندنەوەی ئەم بابەتە پێویستی بە نووسراوی سەرووە.




| I.DH. | 00693.048490 | 13 زیلقەعدە 1291 |
|---|---|---|

بۆ جەنابی ئەفەندم
لـە نـاو سـانجەقی شـارەزوور هەندێـك شـوێنی قۆناغـی حكوومەتـی كـۆی سـانجەق لەگـەڵ ژوورەكانـی سـكاڵا و قەڵـەم وێـران بـووە، لـە موازەنـەی سـاڵی ٩٠ لـە هەژمـاری ڕێكخسـتنی پاشـكۆكان هەژمـار دەكرێـت، ١٣٥٩٥ هەروەهـا پاشـكۆی لیـوای ناوهاتـوو لـە قـەزای سـەڵاحیە پردەكانـی كـوردە و چمنە و نادین لەسـەر شـەقامی پۆسـتە لـە بودجـەی سـاڵی ناوهاتـوو هەژمـار كـراوە، بـۆ ئـەوەی لـە داهاتـی نافیعـە ڕێـك بخرێـت و دابیـن بكرێـت، بـە خـەرج كردنـی ١٦٥٥٠ قـوروش لەگـەڵ ڕەزامەنـدی نـۆژەن كردنـەوەی، ڕاپۆرتـی نەزارەتـی دارایـی جەلیلـە هاوپێـچ پێشـكەش كـراوە و ڕاگەیەنـدراوە، دوای ئـەوەی لەگـەڵ ئەمـر و فەرمانـی جەنابـی مولكـداری یەكسـان دەبێـت ئـەوا پەلـە دەكرێـت لـە جێبەجـێ كردنـی، نـووسراو كـراوە ئەفەنـدم، ١٣ زیلقەعـدە ١٢٩١.




| 1299 زیلحیجە 20 | 00005.00043 | **Y.PRK.UM.** |
|---|---|---|

لە تەحسین پاشای والی موسڵەوە تەلەگرافنامە هاتووە
لـە بـارەی شـێخ عوبێدوڵڵا ئەفەنـدی ئەمـر و فەرمانـی جەنابـی پاشـا دراوەتـە خانـەکان، ئەگەرچـی لـە موسـڵ بەدواداچوون کـراوە، بـەڵام بـۆ ڕۆژێکیـش بێـت لـە شـوێن خـۆی هەواڵێـك وەرنەگیـراوە، ئێسـتا لـە قائیمقامیەتـی کـۆی سـانجەق نـووسراو هاتـووە کـە شـێخی ناوبـراو نێـردراوی ناردۆتـە موسـڵ تـا جولـە بـکات بـۆ موسـڵ، ئـەو هەواڵـە ڕاسـت نییـە، تەنیـا لەگـەڵ ئێـران گفتوگـۆی کـردووە، هەروەهـا شـێخی ناوبـراو هەندێـك دیـاری پێشـکەش بـە جەنابـی شـاهی ئێـران کـردووە و نـووسراوی پاڕانـەوەی نـاردووە، ئەگەرچـی هەواڵـی ئـەوە هاتـووە کـە شـای ئێـران هەندێـك شـوێن و ناوچـە بـۆ ناوبـراو تەرخـان دەکات، بـەڵام ئەنجامەکـە بـە نادیـاری ماوەتـەوە، لـە نامەیـەك هاتـووە شـێخی ناوبـراو بـۆ لای میـر شـەمعون ڕایکـردووە، نوسراوەتـەوە کـە خـۆی لـەوێ حەشـارداوە، بـۆ ئـەوەی بزانرێـت ئـەو چیرۆکانـەی ئێسـتا تـا چەنـد ڕاسـتە، ئـەوا بەپەلـە دەسـت بـە لێکۆڵینـەوە بکرێـت، جگـە لەمـە ناوبـراو لەلایەنـی ڕوانـدز بـۆ ئـەوەی ئـاژاوە دروسـت بـکات، لـە فەرمانگـەی ڕێنمایـی ئەندامـی کۆکردۆتـەوە، سـەید کەمـال لـە خەلیفەکانـی ناوبـراوە هـەر ئێسـتا بـە بـێ ڕوودانـی ڕووداو دەسـتگیر کـراوە و هێنراوەتـە ویلایـەت و دەسـتبەسـەرە، ئـەو ئەندامانـەی کۆکراونەتـەوەش پەرشـوبڵاو کراونەتـەوە، هەمـوو ئامادەکاریـەك ئەنجـام دراون، بـۆ ڕاگەیاندنـی بوێـری کـراوە ئەفەنـدم، لـە ٢١ تشرینـی یەکـەم ١٢٩٨.




| I. ŞD. | 00059.003393 | 13 رەجەب 1299 |
|---|---|---|

شورای دەوڵەت
فەرمانگەی ناوەخۆ
ژمارە ٣٤٣

لە کارگێری ئەنجوومەنی ویلایەتی موسڵ بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە نێردراوە، هەروەها لە ژمێریاری بریارنامە لە مێژووی ٥ رەبیعی کۆتایی ١٢٩٩ ژمارە ٨٩ دەفتەری دەرخستە و پۆستەی کەمکردنەوە و کاغەزی تر دراوەتە شورای دەوڵەت، لە ١٦ جەمادی یەکەم ١٢٩٩ دراوەتە فەرمانگەی ناوەخۆ لەوێ خوێندراوەتەوە. لە بابەتی بریارنامەکە قۆناغی حکوومەتی قەزای کۆی سانجەق ئەو شوێنانەی کە پێویستی بە نۆژەنکردنەوەیە، ٩٧٧١ قوروشی پێویستە، ئەمەش بە دەرخستە دەرکەوتووە، بۆ وەرگرتنی رەزامەندی و هاوپێچی ژمێریاری لە موازنەی ساڵی ٩٨ بۆ ویلایەتی موسڵ خەرجی نۆژەنکردنەوە ٨٠٠٠ قوروش تۆمار کراوە، بەڵام راگەیەندراوە واتە هێشتا موازەنەکە قەبوڵ نەکراوە و پەسەند نەکراوە. قۆناغی ناوبراو زیاد لە خۆی وێران بووە، بە پێویست زانراوە کە دەبێ نۆژەن بکرێتەوە، هەروەها لە وێنەی ئاماژە پێکردنی دەرکەوتووە کە دواکەوتنی نۆژەنکردنەوەی لە کۆتادا خەرجی زیاتری بەدوا دێت، دوای پەسەند کردن و قەبوڵ کردنی موازەنەی ساڵی ٩٨ مامەڵەی هەژمارەکە جێبەجێ دەکرێت، قۆناغی ناوهاتوو بەم برە پارەیە نۆژەن دەکرێتەوە، بە رەزامەندی ویلایەتی ناوهاتوو حەواڵەی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە دەبێت، بە نووسراو دەفتەری دەرخستە و پۆستەی کەم کردنەوە هاوپێچ پێشکەش کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ١٣ رەجەب ١٢٩٩ و لە ١٩ مایس ١٢٩٨


i. DH 943/74686

İ.DH. 00943

| I.DH. | 00943.074686 | 2 جەمادی کۆتایی 1302 |
|---|---|---|
| باش کیتابەتی ما بەینی هومایۆن<br>تایبەتی<br>لە پاشکۆکانی ویلایەتی موسڵ، لە بارەی گۆرینی کارگێری کۆنی قەزای کۆی سانجەق، لە شوێن خۆی قسەی لەسەر کراوە، لەسەر هەندێك ووتە ئەو تەکیە و مزگەوتانەی کە دەیانەوێت بیگۆرن بۆ بنکەی پۆلیس، ئەوا چاوپێداخشاندنەوەی بۆ بکرێت، بۆ ئەوەی لەسەر باری کۆنی بمێنێتەوە بە واژووی کاك ئەحمەد ئەفەندی داواکاری دەرچووە، هاوپێچ تەلەگرافنامەی جەنابی خەلافەتپەناهی نێردراوە تێدا هاتووە تەکیە و مزگەوتی ناوهاتوو لەسەر باری کۆنی بمێنێتەوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢ جەمادی کۆتایی ١٣٠٢ و لە ٥ شوبات ١٣٠٠. | | |




| I.DH. | 01021.080543 | 7 جەمادی یەکەم 1304 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ١٦١١
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی عالی
راگەیەندراوی بەندەیە

لە بارەی دامەزراندنی علی رزا ئەفەندی قائیمقامی پێشووی قەلعەچیك لە قائیمقامیەتی قەزای کۆی سانجەقی ناو ویلایەتی موسڵ، لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران یەك بریارنامە نووسراوەتەوە، بەڵام هێشتا ئەرکەکەی جێبەجێ نەکردووە، لە بارەی لێکۆڵینەوە داواکاری پێشکەشی سەدارەتپەناهی کراوە، لە کاتی حەواڵە کردنی خوێندنەوەی بۆ کراوە، بە گوێرەی ئەو زانیاریەی تۆمار کراوە، لەم بارەیەوە لە قۆمیسیۆنی ناوهاتوو بریارنامە رێکخراوە، ئەگەرچی لە ٢٨ سەفەر ١٣٠٤ پێشکەشی سەدارەتپەناهی کراوە و راگەیەندراوە، بەڵام فەرمانی دەرچووە، لەم حاڵەتە جێبەجێ کردنی رای وەکالەتپەناهی هاوپێچ داواکاری ناوهاتوو پێشکەش کراوە و نێردراوەتەوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٧ جەمادی یەکەم ١٣٠٤ و لە ١٩ کانوونی دووەم ١٣٠٢
نازری کاروباری ناوەخۆ


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
1380 100

DH.MKT.01380.00100.001

| DH.MKT. | 01380.00100 | 28 سەفەر 1304 |
|---|---|---|
| ٢٨ سەفەر ١٣٠٤<br>١٣ تشرینی دووەم ١٣٠٢<br>بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی<br>لە ناو ویلایەتی موسڵ، قائیمقامیەتی قەزای کۆی سانجەق بە وەکالەت بەرێوە دەچێت، قائیمقامی پێشوو عەلی رزا ئەفەندی لە چینی سێیەم هەڵبژێردراوە، دامەزراندنی کراوەتە نووسراو، لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران بریارنامە رێکخراوە و هاوپێچ لەگەڵ کاغەزی وەرگێردراوی زانیاری بەیەکەوە پێشکەشی پێشەوا جەنابی سەدری ئەعزەمی سەدارەتپەناهی کراوە، بۆ جێبەجێ کردنیشی فەرمان و رای سەرووی جەنابی وەکالەتپەناهیە. | | |



| 7 جەمادی یەکەم 1304 | 01396.00075 | DH.MKT. |
| --- | --- | --- |

٧ جەمادی یەکەم ١٣٠٤
١٩ کانوونی دووەم ١٣٠٢
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
لە بارەی دامەزراندنی عەلی رزا ئەفەندی قائیمقامی پێشووی قەلعەجیک لە قائیمقامیەتی قەزای کۆی سانجەقی ناو ویلایەتی موسڵ، ئەگەرچی لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران بریارنامەیەك دەرکراوە، بەڵام هێشتا لە ئەرکەکەی دەست بەکار نەبووە، داواکاری حەواڵەی سەدارەتپەناهی کراوە تا لە کارەکەی ببوردرێت، داواکاریەکە خوێندراوەتەوە، بە گوێرەی ئەو زانیاریە تۆمارکراوانەی وەرگیراوە، لەم بارەیەوە لە قۆمیسیۆنی ناوهاتوو بریارنامەی رێکخراوە و لە ٢٨ سەفەر ١٣٠٤ پێشکەشی سەدارەتپەناهی کراوە و راگەیەندراوە، بەڵام فەرمانی پاشای لەسەر دەرنەچووە، لەم حاڵەتەدا لەسەر جێبەجێ کردنی رای وەکالەتپەناهی، داواکاری ناوهاتوو بە هاوپێچ پێشکەش کرا و گەرێندرایەوە.



DH.MKT.01425.00031.001

| DH.MKT. | 01425.00031 | 19 رەمەزان 1304 |
|---|---|---|

١٩ رەمەزان ١٣٠٤
٣٠ مایس ١٣٠٣
بۆ ویلایەتی بەغدادی جەلیلە
ئەو توتنانەی لە سلێمانیە و کۆی سانجەق دەگوازرێنەوە بۆ بەغداد، فەرمانی پاراستنیان لە ویلایەتی جەلیلە دراوە و ڕاگەیەندراوە، بە لەدەستدانی ئەمنیەت ئەو شتانەی کە دێت وەستێنراوە، چوار هەفتەیە نامەکان لە کەرکووك ماوەتەوە، پۆستە کار ناکات، بۆیە لەلایەن نەزارەتی ڕەژیەوە ئاگاداری نێردراوە، ئەگەر پێویست بکات لەو شوێنانەی توتن بۆ بەغداد دەچێت بپارێزرێن یاخود نووسراوی فەرمانگەی ڕەژی شوێنەکان بە ڕێکوپێکی ڕەوان بکرێت، لە ئەفسەری ڕەژیوە ڕاگەیاندن ڕاگەیەندراوە، بۆ جێبەجێ کردنی ئاماژە بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە نێردراوە، لەبەر گرنگی بابەتەکە هەرچی زووە بە پەلە چارەسەرێك بدۆزرێتەوە، پۆستەکان بپارێزرێن و لە بارەی ئەو ئاماژەوە هیممەت بۆ ویلایەتپەناهی عالیە.



DH.MKT.01494.00037.001

| DH.MKT. | 01494.00037 | 1 رەجەب 1305 |
| --- | --- | --- |

١ رەجەب ١٣٠٥
١ مارت ١٣٠٣
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
دیوانی عورفی جەنگی کە لە ویلایەتی شارەزوور ڕێکخراوە، لە بارەی ڕێکخستن و ئەرکەوە لەلایەن هاوکاری جەنابی ئیسماعیل حەقی پاشا کە لە کەرکووکە نێردراوە، بە نووسراو بۆ لایەنی سەر عەسکەر نێردراوە، لێرە لەو ٩ نوسراوەی کە بۆ کارگێری عورفیەی دیوانی جەنگی حەواڵە کراوە، نووسراوی ژمارە ١٢٣ هاوپێچ بڕیارنامەی لێکۆڵینەوەی دادوەری یەکەی کارگێری عورفیە لەگەڵ بڕیارنامەکەی تری پەسەند کراوی دیوانی جەنگی شارەزوور تێدا هاتووە، عەبدوڵڵا ئاغا و بایز لە برادەرەکانی سەرۆکی هۆزی بلباس محەمەد ئەمین ئاغا لەگەڵ پیاوەکانیان بە ناوی مامە شانی، ٣٢٦٣ قیران، ٥ یوك کەلوپەلیان لە دانیشتوانی قەزای کۆی سانجەق قەساب مام عەلی ئیسماعیل تالان کردووە و دزیویانە، بە شایەد سەلمێنراوە و پەسەند کراوە، پشت بەستن بە یاسانامەی سزای مولکیە ماددەی ٦٢ دەستەواژەی یەکەم هەروەها لە مێژووی دەستبەسەرکردنیان هەر یەکە ماوەی سێ ساڵ بە سزای سەوڵ لێدان زیندانی دەکرێن، هەروەها لە نەبوونی ئەوان بڕیار درا پارەی ناوهاتوو بۆ خۆیان دەستەبەر دەکرێت، جگە لەمە بڕیارەکە بە گوێرەی یاسا گونجاوە، لە بارەی جێبەجێ کردنیشی لەسەر ئاماژەی والای سەر عەسکەر بە ڕەزامەندی فەرمانی پاشای جەنابی تاجدار فەرموویەتی، چۆنیەتیەکەشی بە سەر عەسکەر ڕاگەیەندراوە، بە ڕاگەیەندراوی عالی و جێبەجێ کردنی بە فەرمان و نووسراوی سەدارەتپەناهی دەبێت و هیممەت دەکرێت لە جێبەجێ کردنی.




| 3 رەجەب 1305 | 01494.00109 | DH.MKT. |
| --- | --- | --- |

بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
٣ رەجەب ١٣٠٥
٣ مارت ١٣٠٤

لە ژێر سەرۆکایەتی جەنابی ئیسماعیل پاشا دیوانی جەنگی عورفی پێکهێنراوە، لەلایەن ناوبراویشەوە نێردراوە، لێرە حەواڵەی کارگێری عورفی دیوانی جەنگی بووە، لە ١٠ نووسراو نووسراوی ژمارە ١٢٠ لەگەڵ بریارنامەی هاوپێچ لە هۆزی بلباس مام زەندین و مام رەسوڵ لەگەڵ پیاوەکانی حەمدۆك و پیرەباب و حەمزە لە دانیشتوی قەزای کۆی سانجەق قادر کوری ئەحمەدی لە دەوروبەری چیای سوڵتان ئەیوب بەستۆتەوە، ئاژەڵ و هەندێك ئەرزاق و کەلوپەلیان تاڵان کردووە، دوای پەسەندکردنی حەمدۆك و پیرەباب و حەمزە بە یاسایی سزای هومایۆن ماددەی ٦٢ دەستەواژەی یەکەم لە مێژووی دەست بەسەرکردنیانەوە دوای ئەوەی بە خەڵك نیشان دەدرێن، هەر یەکە سێ ساڵ بە سزای سەوڵ لێدان سزا دەدرێن، ئەو بریارەی کە دراوە بە گوێرەی حوکمی یاسایی بە گونجاو زانراوە، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە، بریارنامەی باسکراو و ووتەی دیوانی جەنگی بە هاوپێچ نێردراوە، لەسەر نووسراوی سەرعەسکەری عالی سەبارەت بە جێبەجێ کردنی دراوەتە سەدارەتپەناهی، بە رەزامەندی فەرمانی پاشای جەنابی پاشا وێنەی بابەتەکە بە سەر عەسکەری ناوهاتوو نیشان دەدرێت، بۆ ئەمەش نووسراو کراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا.




| 1305 شەعبان 29 | 01507.00095 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٩ شەعبان ١٣٠٥
٢٨ نیسان ١٣٠٤
بۆ ویلایەتی موسڵ بەهیە
لە ناو ویلایەتی بەهیە قائیمقامی قەزای كۆی سانجەق عەلی رزا ئەفەندی لە ویلایەتەوە دوورخراوەتەوە، بۆیە رایگەیاندوە كە غەدری لێكراوە، لەگەڵ داواكاریەكەی بۆ سەدری ئەعزەمی سەدارەتپەناهی نێردراوە، ئەو تەلەگرافنامەیەی هاوپێچ نێردراوە، بە لێكۆڵینەوە هۆكاری دوورخستنەوەی ناوبراو راگەیەندراوە.




Y.A.HUS.00223.00037.001

| Y.A.HUS. | 00223.00037 | 16 ره‌جه‌ب 1306 |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>٢<br>لـە قەزاكانـی هەولێـر و كـۆی سـانجەق كۆلێـرا و نەخۆشـی تـر نییـە، بـەڵام سـەرەتا لـە كـۆی سـانجەق بـە هـۆی نەخۆشـی گرانەتـا چەنـد كەسـێك مـردووە، بـەڵام ئێسـتا ئەلحەمدولیلـلا نەمـاوە، ئەمـەش بـە موتەسـەرفی شـارەزوور راگەیەنـدراوە، تەلەگرافنامـە لـە والیەتـی ویلایەتـی موسـڵ هاتـووە، راگەیەنـدراوە و پێشـكەش كـراوە ئەفەندیـم، لـە ١٦ رەجـەب ١٣٠٦ لـە ٧ مـارت ١٣٠٥.<br>سەدری ئەعزەم | | |


٤٩٥

I.DH 1118/87439

İ.DH.01118

| I.DH. | 01118.087439 | 20 ڕەبیعی یەکەم 1306 |
|---|---|---|

نەزارەتی کاروباری دارایی
ئەنجوومەنی دارایی
٤٩٥
ڕاگەیەندراوی بەندەیە
لە ناو ویلایەتی موسڵ بەڕێوەبەری ڕەژی قەزای کۆی سانجەق محەمەد شەفیق ئەفەندی بە شایەدبوون لەسەر کارەکانی کارگێری و خزمەتی باشی و بوێریەکەی، لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی کارگێری گشتی ڕەژی پلەی سێیەمی پێ دراوە، بەو نووسراوەی کە بە قۆمیسیۆن ڕاگەیەندراوە تێدا داواکراوە، بۆ جێبەجێ کردنیشی ڕای سەدارەتپەناهی دراوە، بە ووتەی ئەنجوومەنی دارایی ڕاگەیەندراوە و پەلەکراوە لە ڕاگەیاندنی، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٠ ڕەبیعی یەکەم ١٣٠٦ و ١٢ تشرینی دووەم ١٣٠٤.
وەکیلی کاروباری دارایی




| | | |
|---|---|---|
| I.DH. | 01126.087972 | 11 رەجەب 1306 |

کۆشکی یڵدزی هومایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
بە فەرمی هەواڵ هاتووە کە لە موسڵ و هەولێر و کۆی سانجەق لەگەڵ رواندز کۆلێرا بڵاوبۆتەوە، لە باڵیۆزخانەی تاران تەلەگرافنامە وەرگیراوە، هەروەها زانیاری دراوەتە فەرمانگەی تەندروستی، لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی دەرەوەی جەلیلە هاوپێچ بەیەکەوە پێشکەش کراوە، هەروەها بە تێروانین لەوەی کە لە ویلایەتی موسڵ بۆ رۆژێکیش بێت ئاماژەی پێ نەکراوە، لە بارەی راست و دروستی ئەم چیرۆکە هیچ بریارێك نەدراوە، لەگەڵ ئەوەش لە ویلایەت بە تەلەگرافنامە داوای نووسراوی بە زانیاریان کردووە، لەگەڵ هاتنی نووسراوی تایبەتی سەدری ئەعزەم لە مێژووی ١١ رەجەب ١٣٠٦، بە راگەیاندنی لە سەدارەتپەناهی، ئەگەر هاتوو راستی بابەتە پەسەندکرا ئەوا پێویستە ئامادەکاری تەندروستی ئەنجام بدرێت، بۆ ئەوەی بەبێ دەردوبەڵا کاتەکە تێپەرێت کارەکان جێبەجێ بکرێن، لەم بابەتەدا لەگەڵ ویلایەتی ناوهاتوو پەلە بکرێت و گفتوگۆی گرنگ ئەنجام بدرێت، ئەگەر چیرۆکەکە راست بێت ئەوا بزانرێت نەخۆشەکە لە کوێ و چ کاتێك سەری هەڵداوە، هەروەها لە کوێش تەشەنەی کردووە بۆ شوێنەکانی تر و جگە لەمە ئەمرۆ لە چ پلەیەکە، بزانرێت لە خۆجێی چ ئامادەکاریەك ئەنجام دراوە، ئەو زانیاریە راست و دروستانەی کە وەردەگیرێن یەکسەر بە سەروو رابگەیەندرێت، لەگەڵ ئەوەشدا لەمەوپێش لەلایەنی سلێمانی کۆلێرا سەری هەڵدا بوو، لەسەر ئەم هەواڵە بۆ ئامادەکاری خۆجێی و جێبەجێ کردنی کاری پێویست نووسراو لە ١٤ جەمادی کۆتایی ١٣٠٦ بە پوختی و تێروتەسەل نووسراوەتەوە کە هەر ئێستا دەست بە کار بکرێت و یەك خولەك بەفیرۆنەدرێت، لێرە و لە ویلایەت ئەوەی پێویستە جێبەجێ بکرێت، هەر ئێستا فەرمان بدرێت ئەمر و فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی جێبەجێ دەکرێت، لەم بابەتە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ١١ رەجەب ١٣٠٦ و لە ٢ مارت ١٣٠٥.
سورەیا سەر کاتیبی جەنابی شەهریار


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
1641 | 127

DH.MKT.01641.00127.001

| DH.MKT. | 01641.00127 | 25 ڕەبیعی یەکەم 1306 |
| --- | --- | --- |
| ٢٥ ڕەبیعی یەکەم ١٣٠٦<br>١١ تەمموز ١٣٠٥<br>بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە<br>بـۆ گۆڕینـەوەی ئەرکـی جەمـال ئەفەنـدی قائیمقامـی قـەزای کـۆی سـانجەق لەگـەڵ نەشـئەت ئەفەنـدی قائیمقامـی زێبـار بـە تەلەگـراف لـە ویلایەتـی موسـڵی بەهیـە کۆتایـی پـێ هاتـووە، بـەڵام ئـەم جـۆرە بابەتانـە بـە بڕیـاری ئەنجوومەنـی کارگێـری ویلایـەت ڕادەگەیەنرێـت و بـە مـاددەی ٣٠ نیزامنامـەی تایبەتـی جێبەجـێ دەکرێـت، لـە سـەرەتادا بـە گوێـرەی نیـزام پێویسـتە بـە بڕیارنامـە کۆتایـی پـێ بێـت، نـووسراو بـۆ واڵا کـراوە بـە گفتوگۆکـردن لـە قۆمیسـیۆنی هەڵبژاردنـی فەرمانبـەران هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی. | | |

Y.PRK.PT 6/93

2

Y.PRK.PT.00006.00093.002

| Y.PRK.PT. | 00006.00093 | 23 زیلقەعدە 1307 |
|---|---|---|
| وێنە<br>ئـەو مەفرەزەیـەی لـە چاڵەگەردەلـە سـەر بـە قـەزای کـۆی سـانجەق لـە ئەرکـی بەدواداچوونـدا بـووە، بـە ڕێکـەوت لەگـەڵ هەمەوەنـدەکان بۆتـە شـەڕیان، لـە هەمەوەنـدەکان حەسـەن کـوڕی حوسـێن کاکـە لـە سـنگی دراوە و زۆر بـە خراپـی برینـدار کـراوە، ئـەوەی تریـش کـوژراوە و دوو ئاژەڵیشـیان مـردار بوونەتـەوە، لـە نزیـك شـوێنی ناوهاتـوو لەلایـەن دانیشـتووانی گونـدەکان هـەواڵ وەرگیـراوە. جەنابی شەهریاری ......<br><br>وێنـەی ئـەو شـیفرەیەی کە لە بـاش مودیرەتی بەغداد وەرگیراوە، لە بـاڵا ڕاگەیەندراوە فەرمان، لـە ١٣ حوزەیران ١٣٠٦. | | |





Y.PRK.ASK.00061.00029.001

| Y.PRK.ASK. | 00061.00029 | 10 شەوال 1307 |
|---|---|---|
| لە قوماندانیەتی کەرکووکەوە تەلەگرافنامەی بە شیفرە هاتووە<br>حوسێن عەزیز لە چەتەکانی هەمەوەند لەگەڵ ٣٢ ئەسپ سوار لە سنووری ئێران بوونیان هەیە، لە دەورووبەری گوندی تەقلتوی قەزای کۆی سانجەق بە ڕێکەوت ڕووبەڕووبوونەوە ڕوویداوە، لەوانە محەمەد کوڕی حەسەن کاك هەمەوەند بریندار بووە، لە چوار سەر ئاژەڵیش یەکێکی لەناوچووە، یەکێکیش بە برینداری بەجێ هێڵدراوە، هەروەها دوو سەر مایینیش دەستکەوتوون، لەلای ئێمەوە یەك ئێستر لەناوچووە، لە بەدواداچوونیش بەردەوامین، لەسەر تەلەگرافی یوزباشی حەسەن ئەفەندی لە مەفرەزەی ئێستر سوارە ڕاگەیەندراوە فەرمان، لە ١٨ مایس ١٣٠٦.<br>فەریق ئەدهەم لە قوماندانیەتی فرقەی ١٢ | | |




Y.PRK.ASK.00061.00082.001

| | | |
|---|---|---|
| **Y.PRK.ASK.** | 00061.00082 | **7 زیلقەعدە 1307** |

بۆ قوماندانیەتی کەرکووك نێردراوە
چەند رۆژ لەمەوبەر لە نزیك چەمچەماڵ بە چاودێری کردنیان لە کەنداوی کۆپری پەریونەتەوە، لەلای کۆی سانجەق لە دەوروبەری گوندی چالەکەردە بە رێکەوت لەگەڵ چەتەکانی هەمەوەند رووبەروو بوونەوەیەکی توند روویداوە، لە چەتەکان یەك کەس لە مەیدانی جەنگ کوژرا و لە سەرۆکەکانیش عەبدولرەحیم و سۆفی مەحمود و مەحمودی حەمە بریندار بوونە، جگە سێ مایین لەناوچوون و ماینێکیش دەستکەوتووە، لەلایەنی ئێمەش تەنیا یەك ئێستر لەناوچووە، لەلایەن عەلی ئەفەندی و حەسەن ئەفەندی یوزباشی مەفرەزەکان ئەو زانیاریانە نووسراوەتەوە، لە هەر بارودخێکیشدا بەهۆی ئەو کاردانەوەیە جەنابی پاشا سوپاس و پێزانین پێشکەش دەکات، چونکە خێرا بەرگری کراوە و کۆتایی بەم کێشەیە هێنراوە، جگە لەمەش لەلایەن مەفرەزەکانیشەوە دەستگیرکراو هەیە، راگەیەندراوە فەرمان، لە ٢٢ تەمموز ١٣٠٦.
فەریق ئەدهەم قوماندانی فرقەی ١٢




تلغراف نامه



<table>
<tr><td>DH.ŞFR.</td><td>00142.00016</td><td>12 جەمادی یەکەم 1307</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>لە ٢١ کانوونی یەکەم ١٣٠٥، حەسەن ئەفەندی بۆ موسڵ و حاجی مستەفا ئەفەندی بۆ کەرکووك و عەلی بەگ بۆ سلێمانیە و ئەحمەد ئاغا بۆ هەولێر و ئەحمەد ئەفەندی بۆ رواندز و عەبدوڵلا ئاغا بۆ کۆی سانجەق و حاجی محەمەد شەریف بۆ عەقرە و سەید حوسێن ئاغا بۆ سەلاحیە لە سەرۆکایەتی شارەوانی دەست بە کاربوونیان رادەگەیەندرێت، لە ٢٣ کانوونی یەکەم ١٣٠٥.<br>تاهیر والی موسڵ</td></tr>
</table>


İ.DH. 1169/91381

İ.DH.01169

| 17 جەمادی کۆتایی 1307 | 01169.091381 | I.DH. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ١٥١٣
جەنابی سەدارەتپەناهی
راگەیەندراوی بەندەیە
گۆرینەوەی شوێنی ئەرکەکانی قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق جەمال ئەفەندی لەگەڵ قائیمقامی قەزای زێبار نەشئەت ئەفەندی، لە ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەتی موسڵ بە بریار ئاماژەی پێکراوە و نووسراو کراوە، لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران دراوەتە قەڵەم، بریارنامە بە هاوپێچەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەسەر هاوکاری جەنابی فەخامەتپەناهی جێبەجێ دەکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ١٧ جەمادی کۆتایی ١٣٠٧ و لە ٢٧ کانوونی دووەم ١٣٠٧
نازری کاروباری ناوەخۆ




| DH.MKT. | 01660.00143 | 29 موحەررەم 1307 |
|---|---|---|

٢٩ موحەررەم ١٣٠٧
١٣ ئەیلوول ١٣٠٥
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
ئـەو هەمەوەندانـەی بـۆ شـوێنێکی دوور دوورخرابوونـەوە، ١٥ تـا ٢٠ نەفەریـان هەڵاتـوون، لـە نـاو سـاوجبۆڵاقی ئێـران کاکەڵـڵا یەکێکـە لـە کورەکانـی سـەرۆکی هـۆزی مەنکـور، سـنووری بەزانـدووە و ناوچـەی دزنـەی گرتـووە، لەگـەڵ هاوەڵەکانـی چەتـە بایـز بـە ٤٠ ئەسـپ سـوار هاتۆتـە قـەزای کـۆی سـانجەق چ جـۆرە زوڵـم و سـەرپێچی و غەدرێکیـان کـردووە لەلایـەن عەبدولقـادر شـێخی تەریقەتـی قادریـە و هاوەڵانـی بـە واژووی خۆیـان تەلەگرافنامەیـان نـاردووە تـا ئـەم کارە جێبەجـێ بکـەن، تەلەگرافنامەکـە هاوپێـچ نێـردراوە تێروانیـن لـە بابەتەکـە بـە لێکۆڵینـەوە راگەیەنـدراوە هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.




DH.MKT.01707.00024.001

| DH.MKT. | 01707.00024 | 19 رەجەب 1307 |
|---|---|---|

١٩ رەجەب ١٣٠٧
٢٧ شوبات ١٣٠٥
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
سەرەتا بە تەلەگراف راگەیەندراوە کە گۆڕینەوەی ئەرکەکەیان کراوە، قائیمقامی کۆی سانجەق جەمال ئەفەندی لەگەڵ قائیمقامی قەزای زێبار نەشئەت ئەفەندی لە مێژووی دەستبەکاربوونیان تۆمارکراوە کە مانگانە هەر یەکە ١٢٥٠ قوروش وەردەگرێت، بە دابینکردنی تۆماریان رێکخراوە، سەبارەت بە مێژووە دیاریکراوەکان بۆ والا نێردراوە، نووسراوەکە لە نەزارەتی ژمێریاری گفتوگۆی لەسەر کراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

| 18 شەوال 1308 | 00064.00073 | MV. |
|---|---|---|

١٨ شەوال ١٣٠٨
١٥ مایس ١٣٠٧
پوختەی دارایی
لە زاناکان کوچك ئاغازادە حاجی عومەر ئەفەندی دانیشتووی هەولێر و حاجی عەبدوڵڵا ئەفەندی دانیشتووی کۆی سانجەق لە بەغداد و موسڵ و بەسرا و کوردستانی سەر بە ئێران، لە شوێنی ئاوا بێ هاوتا ئامادە بوونە و وانەیان ووتۆتەوە، لە بارەی بژێوی ژیانی خێزانەکانیان دووچاری سەرگەردانی و دەردەسەری بوونەتەوە، ئەگەر سەروو رەزامەندی بفەرمووێت بۆ ناوبراوان برێکی گونجاو مووچەیان بۆ ببڕێتەوە، لەسەر هەندێك ووتە ئەو نووسراوانە خوێندراوەتەوە کە لە ویلایەتی موسڵ هاتووە.

بریار
لە پوختەی بابەتەکە روون بۆتەوە، ناوبراوان بە ووتنەوەی زانست و زانیاری سەرقاڵن، لەسەر گەشتی وانە ووتنەوەکەیان بە تایبەتی ئەو پارچە کوردستانەی سەر بە ئێرانە، وانە بە قوتابیانی ئەو پارچەیە دەڵێنەوە، ئەوانە دووچاری دەردەسەری بوونەتەوە، هەندێك رۆژ کاریگەری لەسەریان دروست دەکات، بۆ چاککردنی بژێوی ژیانیان و رێزگرتن لە هیممەت و خزمەتەکانیان دەرکەوتووە سوود و چاکەیان پێویستە، بۆ ناوبراوان هەر یەکە ١٠٠٠ قوروش مووچەیان بۆ دابین بکرێت، بە بریارنامە رەزامەندیەکە بوو بە بریار.




DH.MKT.01803.00114.001

| DH.MKT. | 01803.00114 | 17 جەمادی کۆتایی 1308 |
|---|---|---|

١٧ جەمادی کۆتایی ١٣٠٨
١٦ کانوونی دووەم ١٣٠٦
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
لەبەر ئەوەی پارەوپولی شارۆچکەیەکیان تاڵان کردووە، لەلایەن دیوانی جەنگی عورفی هەر یەکە بە ماوەی سێ ساڵ زیندانیکردن حوکمیان لەسەر دراوە، پێش حەوت تا هەشت مانگ بە دەستبەسەرکردنی برادەرەکانی سەرۆکی هۆزی بلباس عەبدوڵلا ئاغ و بایز ئاغا، داواکارەکان دەرنەکەوتوون و تێروانین لە فەرمانی دەستبەسەرکردنی چەتەکان کۆشش و کارەکانیان بینراوە، بۆیە وا گونجاوە ئازاد بکرێن، لە ویلایەتی بەهیە دەرچووە و عالی فەرموویەتی و بە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا تەلەگرافنامە بۆ بابی عالی نێردراوە، لەسەر ئەو نێردراوە لەگەڵ والای سەر عەسکەر گفتوگۆ کراوە، لە وەڵامی نووسراودا برادەرەکانی سەرۆکی هۆزی ناوهاتوو محەمەد ئەمین ئاغا لەگەڵ پیاوەکانیان بە ناوی مامە شالی، ئیسماعیلی کوڕی قەساب مام لە دانیشتوانی قەزای کۆی سانجەق ٥ یوک کەلوپەلیان تاڵان کردووە، بۆیە لەگەڵ ماوەی باسکراودا بریار دراوە سزای سەوڵ لێدانیان بەسەر سەپێنراوە، دوای رەزامەندی فەرمانی پاشای جەنابی پاشا لە مەرکەز دەرچووە، بە تۆمار دەرکەوتووە ناوبراوان لەگەڵ ئەوانەش بەیەکەوە مامە شالی کە سزا دراوە، لێبوردنی گشتی گرتوویەتیەوە و بە باش زانراوە جێبەجێ بکرێت، ئەمەش فەرمانی پاشای جەنابی پاشا بفەرمووێت چۆنیەتیەکەی بە سەر عەسکەری ناوهاتوو رادەگەیەندرێت، بە ئاماژەی عالی بە فەرمانی پاشا داواکراوە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.




BEO.000008.000530.001

| BEO. | 000008.000530 | 24 شەوال 1309 |
|---|---|---|

٢٤ شەوال ١٣٠٩
٩ مایس ١٣٠٨
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
نەشئەت ئەفەندی قائیمقامی کۆی سانجەقی پاشکۆی سانجەقی شارەزوور، لە ئەرکەکەی بوردراوە، بۆ شوێنەکەی عەباس ئەفەندی قائیمقامی عانە دابمەزرێت، کە لە ئەرکەکەی جیابۆتەوە و لە چینی سێیەم هەڵبژێردراوە، سەبارەت بە دامەزراندنی نووسراوی لە مێژووی ١١ شەوال ١٣٠٩ ژمارە ٢٠٤ دوای رەزامەندی فەرمانی پاشای جەنابی تاجدار فەرموویەتی، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی کارەکە، بۆ ئەم مەبەستە نووسراو بکرێت.


BEO.000024.001753.001

| | | |
|---|---|---|
| BEO. | 000024.001753 | 27 زیلقەعدە 1309 |

٢٧ زیلقەعدە ١٣٠٩
١٠ حوزەیران ١٣٠٨
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لە ناو ویلایەتی بەسرا، بۆ قائیمقامیەتی قەزای قورنە، محەمەد نەشئەت ئەفەندی دامەزرێت کە لە قائیمقامیەتی کۆی سانجەق بوردراوە، بۆ ئەم مەبەستە نووسراوی ٩ زیلقەعدە ١٣٠٩ ژمارە ٣٧١ بە ڕەزامەندی دەوڵەت، فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی بفەرمووێت هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



| 27 جەمادی یەکەم 1309 | 000024.001796 | BEO. |
| --- | --- | --- |

٢٧ جەمادی یەکەم ١٣٠٩
١٠ حوزەیران ١٣٠٨
بۆ نەزارەتی دەرەوەی جەلیلە
لە ساوچبۆلاق لە بارەی دەستدرێژی کردنە سەر کچێکی ئینگلیز، لەسەر مەسەلەی ئەو دەستدرێژیە، مامەڵەی سەرکەشانەی هاوڵاتی عوسمانی بە شێوەیەکی باش لەوێ دەرهێنراوە، بە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا قائیمقامی هەولێر عەبدوڵلا پاشا لەگەڵ عەبدوڵلا ئەفەندی خەڵکی کۆی سانجەق ئەم ئەرکەیان پێ سپێردراوە، وێنەی ئەو راپۆرتەی کە ناردویانە، لەسەر ووتەی ئەم راپۆرتە لە ویلایەتی موسڵ نووسراو هاتووە، لەگەڵ نوسراوی نێردراوی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە، هاوپێچ لەسەر زانیاری نەزارەتەکانی جەلیلە نووسراو نێردراوە.




<table>
<tr><td>BEO.</td><td>000032.002357</td><td>16 زیلحیجه 1309</td></tr>
<tr><td colspan="3">١٦ زیلحیجه ١٣٠٩<br>٢٨ حوزەیران ١٣٠٨<br>بۆ لایەنی سەر عەسکەریمان<br>حاجی ئەمین خەڵکی کۆی سانجەق بە بێ کەسی ماوەتەوە، ناچارە سەرپەرشتی خانەوادەکەی بکات، داوای کردووە نووسراوی رەدیفی قەبوڵ بکرێت، بە واژووی حاجی ئەمین خەڵکی کۆی سانجەق، تەلەگرافنامە لە ٢٣ حوزەیران ١٣٠٨ لە مەرکەزی بەغداد دەرچووە و هاوپێچ بۆ لایەنی والآی سەر عەسکەر نێردراوە، تەلەگرافنامەکەی تر بۆ لایەنی سپاهیداری والا نێردراوە ئەمەش بە نووسراو دەرکەوتووە، بە تێروانین لە داواکاری بابەتەکە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.</td></tr>
</table>


دائرهٔ صدارت

İ.DH 1273/100101

İ.DH.01273

| I.DH. | 01273.100101 | 19 شەوال 1309 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت

....................
جەنابی دەوڵەت

لە ساوچبۆلاقی خاکی ئێران لەسەر مەسەلەی کچێك قسەیان کردووە بۆیە قائیمقامی هەولێر عەبدوڵڵا پاشا لەگەڵ یەکێك لە زاناکانی کۆی سانجەق حاجی عەبدوڵڵا ئەفەندی هەوڵ و کۆششیان داوە و جموجۆڵی سەرکەشانەیان کردووە، هەندێك لە هاوولاتیانی عوسمانیان بە ئاسانی بۆ مەمالیکی شاهانە گوازتۆتەوە و نیشتەجێ کراون، لە ویلایەتی موسڵ ئاماژەی پێکراوە لە پلەی سێیەم بۆ هەر یەکە نیشانی مەجیدی نیشانی پێ بدرێت، بۆ ئەم مەبەستە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بۆ ئەمەش نووسراو ژمارەی لەسەر تۆمار کرا ئەفەندم.
لە ١٩ شەوال ١٣٠٩ و لە ٤ مایس ١٣٠٨
سەدری ئەعزەم و هاوکارەکەی


İ.DH 1273/100115

İ.DH.01273

| I.DH. | 01273.100115 | 20 شەوال 1309 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
جەنابی ئەفەندیم
نەشئەت ئەفەندی قائیمقامی کۆی سانجەق سەر بە سانجەقی شارەزوور لێبوردراوە، بۆ شوێنی ناوبراو عەباس ئەفەندی قائیمقامی عانە لە چینی سێیەم هەڵبژێردراوە، بۆ دامەزراندنی ناوبراو نووسراو کراوە، لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران بریارنامە دراوەتە قەڵەم، لەم بارەیەوە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا بفەرمووێت، جێبەجێ دەکرێت، بۆ ئەم مەبەستەش نووسراو کراوە، لە ٢٠ شەوال ١٣٠٩ و لە ٥ مایس ١٣٠٨.
سەدری ئەعزەم و هاوکاری






DH.MKT.01891.00128.001

| | | |
|---|---|---|
| 16 رەبیعی کۆتایی 1309 | 01891.00128 | DH.MKT. |

بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
١٦ رەبیعی کۆتایی ١٣٠٩
٧ تشرینی دووەم ١٣٠٧

لـە بەڕێوبەرەکانـی قـەزای کـۆی سـانجەق حاجـی ئەسـعەد ئاغـا لەبـەر مەرامـی خـۆی خزمـەت نـاکات، لـە لای فەرمانبەرانـەوە سـکاڵا هەیـە و کاری بـەد ئەنجـام دەدات، هەروەها دەسـت لـە کاروبـاری داد وەردەدات، لەم بابەتە خـودی خـۆی گـوێ بـەم ئاگادارکردنەوانـە نـادات کـە لـە موتەسـەرفەوە بـۆی هاتـووە، پشـت بەسـتن بـە هەندێـك ووتـە لەلایـەن دەسـتەی دادی قـەزای ناوهاتـوو بریارنامـە بـۆ نەزارەتـی دادی جەلیلە نێـردراوە، لەوێشـەوە بۆ لایەنی والا ڕۆیشـتووە، بـە تێروانیـن لـە ووردبینیکـردن ئـەوا بـە پەلـە لێکۆڵینـەوە بکرێـت و بارودۆخەکـە رابگەیەندرێـت.





DH.MKT.01902.00089.001

| DH.MKT. | 01902.00089 | 15 جەمادی کۆتایی 1309 |
|---|---|---|
| ١٥ جەمادی کۆتایی ١٣٠٩<br>٥ کانوونی یەکەم ١٣٠٧<br>بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی<br>لەگەڵ ئەوەی قائیمقامی قەزای کۆی سانجەقە بەڵام بۆ قائیمقامیەتی دهۆك گوازراوەتەوە، ئەمجارە مستەفا سالم ئەفەندی لەگەڵ قائیمقامی سنجار عوسمان نوری ئەفەندی گۆرینەوەیان پێ کراوە، لەسەر ئاماژەی ویلایەتی موسڵ نووسراوی پێ کراوە هاوپێچ بریارنامەی قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران پێشکەش کراوە، لەم بارەیەوە جێبەجێ بکرێت. | | |




| DH.MKT. | 01945.00115 | 11 شەوال 1309 |
|---|---|---|
| ١١ شەوال ١٣٠٩<br>٢٦ نیسان ١٣٠٨<br>بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی<br>پاشکۆی سانجەقی شارەزوور قائیمقامی کۆی سانجەق نەشئەت ئەفەندی داوای کردووە لە کارەکەی ببوردرێت، بۆیە لە شوێن ئەو کەسێکی ئاوێتە بە هۆزگەرایەتی دابمەزرێت بۆ ئەمەش یەحیا بەگ لە خانەدانی قەزای رواندز دابمەزرێت و رەوان بکرێت، بۆ پەسەند کردنی ئەرکەکەی لە کارگێری ئەنجوومەنی ویلایەتی موسڵ بریار نامە دەرچووە، بەلام ناوبراو لە هەڵنەبژێردراوەکانە، بۆیە پەسەند کردنی ئەرکەکەی بە بریاری نیزام گونجاو نییە، بۆ قائیمقامیەتی ناوهاتوو نووسراو کراوە عەباس ئەفەندی دابمەزرێت کە لە قائیمقامیەتی عانە جیابۆتەوە و لە هەڵبژێردراوی چینی سێیەمە، بریارنامە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران دەرچووە لەگەڵ کاغەزی وەرگێردراوی ناوبراو پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی هاوکاری سەدارەتپەناهی پێویستە. | | |




DH.MKT.01957.00044.001

| DH.MKT. | 01957.00044 | 9 زیلقەعدە 1309 |
| --- | --- | --- |

٩ زیلقەعدە ١٣٠٩
٢٣ مایس ١٣٠٨
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
قائیمقامی قەزای قورنە عارف ئەفەندی بەهۆی مردنیەوە لە شوێن ئەو بە وەکالەت سەرۆکی پێشووی شارەوانی بەسرا حاجی محەمەد شەفیق ئەفەندی دامەزراوە و رەوان کراوە، ئەگەرچی پەسەند کردنی ئەرکەکەی لە ویلایەتی بەسرا ئاماژەی پێکراوە، بەڵام ناوبراو لە تاقمی هەڵنەبژێردراوە، بۆیە پەسەندکردنی ئەرکەکەی پێچەوانەی نیزامە، بەڵام محەمەد نەشئەت ئەفەندی لە قائیمقامیەتی قەزای کۆی سانجەق بووراوە و لە مولازمە هەڵبژێردراوەکانە و ئاشنای زمانەکانە جگە لەوە خزمەتی هەبووە، لە بارەی دامەزراندنی ناوبراوەوە نووسراو کراوە، بریارنامە دراوەتە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران لەگەڵ کاغەزی زانیاری کەسێتی وەرگێردراو پێشکەش کراوە، فەرمانی جێبەجێ کردن بۆ جەنابی سەدارەتپەناهیە.




| | | |
|---|---|---|
| DH.MKT. | 01962.00046 | 20 زیلقەعدە 1309 |

٣ حوزەیران ١٣٠٨
٢٠ زیلقەعدە ١٣٠٩
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە

عەبـاس ئەفەنـدی لـە قائیمقامیەتـی قـەزای کـۆی سـانجەق دامـەزراوە، ئـەوەی لێـی دەزانرێـت سـەرەتا لـە قائیمقامیەتـی عانـە جیابۆتـەوە، هـەر لەگـەڵ گەیشـتنی بـۆ شـوێنەکە و لە مێژووی دەسـت بـەکار بوونی بـە بریاری تۆمـار مانگانـە ١٢٥٠ قـوروش مووچـەی بـۆ دابیـن دەکرێت، هەروەها بە ڕێکخسـتنی تۆمار لە مێژووی نـووسراوەوە جێبەجـێ دەکرێـت، جگـە لەمـە بـە بریارنامـە یەکـەم مووچـە کـە وەریدەگرێـت نیـوەی مووچەکـەی هەروەهـا مانـگ بـە مانـگ لەگـەڵ سـەدا پێنج یەکـی بـۆ خانەنشـینی دەروات، هەروەها بـە یەك جـاری مووچـەی دابینکراوی ناوهاتـوو بـە تەواوەتـی لـە سـەدا دەی بـە دەستبەسـەرکردن بۆ سـندوقی قۆمیسـیۆنی پـارەی مولکیـە دەنێردرێت و خەرجـی ڕێگاشـی ٢٠٨٨ قـوروش بـە شـێوەیەکی نەریتـی خۆیـدا لـە پـارەی ناوەخـۆ دەدرێت، خشـتەی خەرجیشـی تۆمـار دەکرێـت و بـۆ سـەروو دەنێردرێـت، لـە ژمێریـاری ئامـاژەی پێکـراوە، هیممـەت بکرێـت لە جێبەجـێ کردنی.




BEO.000094.006982.003

| BEO. | 000094.006982 | 7 جەمادی کۆتایی 1310 |
|---|---|---|

نەزارەتی مەعاریفی گشتی
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٢٠٥
راگەیەندراوی بەندەیە

نائیبی پێشووی کۆی سانجەق عەبدولقادر ئەفەندی لە دار موعەلمینی دەرسەعادەت بڕوانامەی وەرگرتووە، لە روشدییە مامۆستایەتی کردووە و دوا جاریش لە نائیبی قەزا کاری کردووە، زمانەکانی عەرەبی و فارسی و کوردی دەزانێت، داواکراوە لە بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی ویلایەتی موسڵ دابمەزرێت، بە واژووی نائیبی پێشووی کۆی سانجەق عەبدولقادر ئەفەندی تەلەگراف لە موسڵ دەرچووە، لە کۆتاییدا داواکاریەکەی پێشکەش کراوە، لە دوو پارچە نووسراوی سەدری ئەعزەمی جەنابی وەکالەتپەناهی لە مێژووی ٢ رەبیعی کۆتایی ١٣١٠ و ١٨ جەمادی یەکەم ١٣١٠ ئاماژە بە جێبەجێ کردنی کراوە، ئەگەرچی ئەرکەکەی بۆ ماوەی پێنج شەش مانگ پەکخراوە، بەڵام ئەمجارە لە دەرسەعادەت بە پێویست زانراوە بەڕێوەبەری مەعاریف رەسول مستی ئەفەندی ئەرکەکە وەربگرێت لەبەر ئەوەی زانیاری و بارودۆخی خەڵکی دەزانێت و هەستی پێ دەکات، هەروەها ماوەی ٢٥ ساڵە لە مەعاریف خزمەتی پێشووی هەیە، بۆیە داوای دووبارە دامەزراندنەوەی نێردراوە، عەبدولقادر ئەفەندیش بەرپرسیاریەتی نەبینراوە و داواکاری ناوهاتوو بە هاوپێچ نێردراوە و پێشکەش کراوە، لەم بارەیە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٧ جەمادی کۆتایی ١٣١٠ و لە ١٥ کانوونی یەکەم ١٣٠٨.
زوهدی نازری مەعاریف


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
112 | 8374 | 1

BEO.000112.008374.001

| BEO. | 000112.008374 | 7 جەمادی یەکەم 1310 |
| --- | --- | --- |
| ٧ جەمادی یەکەم ١٣١٠<br>١٥ تشرینی دووەم ١٣٠٨<br>بۆ نەزارەتەکانی تەلەگراف و پۆستە و مەعاریف و دارایی جەلیلە<br>سەرەتا بۆ دارایی<br>لە بارەی دابینکردنی خۆراك بۆ ئەوانەی لە تەکیەکانی قەزای کۆی سانجەق کار دەکەن ناوەکانیان تۆمار کراوە و لە ئەنجوومەنی کارگێری شارەزوور پەسەند کراوە. | | |



| | | |
|---|---|---|
| **17 جەمادی یەکەم 1310** | 000118.008809 | **BEO.** |

١٧ جەمادی یەکەم ١٣١٠
٢٥ تشرینی دووەم ١٣٠٨
بۆ نەزارەتی مەعاریفی جەلیلە
نائیبی کۆی سانجەق عەبدولقادر ئەفەندی ترابزۆنلی بە بڕوانامەی دارموعەلمینی دەرسەعادەت بۆ ڕوشدیەی موعەلمینی موسڵ ڕۆیشتووە، دوای سێ ساڵ لە نائیبی قەزاکان کاری کردووە و زمانی عەرەبی و فارسی و کوردی دەزانێت، داوا کراوە لە بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی ویلایەتی موسڵ دامەزرێت، تەلەگرافنامە بە واژووی ناوبراو لە ٢ ڕەبیعی کۆتایی ١٣١٠ نووسراو بۆ دەوڵەت نێردراوە، بۆ دووبارەبوونەوەی داواکردنەکە و هەندێك ووتە ئەمجارە لەلایەن ناوبراوەوە داواکاری نێردراوە، داواکاریەکە بۆ سەدری ئەعزەم ڕەوانە کراوە، لەسەر ئاماژەی پێشوو و تێروانین لە بابەتەکە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی و نووسراو بکرێت.


MF.MKT.00154.00102.001

| MF.MKT. | 00154.00102 | 19 رەبیعی کۆتایی 1310 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی مەعاریفی جەلیلە
بەهۆی گرنگی شوێنەکەی و زۆری دانیشتوانەکەی لەگەڵ دیاربوونی گەورە و بچووکی رەگەزەکانی، لە ناو سانجەقی شارەزوور قەزای کۆی سانجەق لە ناو تاریکی و نەزانی دان، لە نوری زانست بێ بەشن، بۆیە بە مەبەستی دروست کردنی مەکتەبێکی سەرەتایی لە قەزای ناوهاتوو داواکاری لەلایەن زانا و شێخ و دارتاش و دانیشتوانی جیاجیا پێشکەش کراوە و تکا کراوە، ئەگەر سەیری گەورەیی قەزاکە و زۆری دانیشتوانی بکرێت، دروست کردنی مەکتەبێکی سەرەتایی سوودی دەبێت، بۆ جێبەجێ کردنیشی بە بریاری ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەت راگەیەندراوە، لە ٢٩ تشرینی یەکەم ١٣٠٨.
عوسمان والی موسڵ




| 18 جەمادی یەکەم 1310 | 00157.00026 | MF.MKT. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەتی پایەبەرز
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٣٢٠
بۆ نەزارەتی مەعاریفی جەلیلە
جەنابی ئەفەندم
نائیبی پێشـوی کۆی سـانجەق عەبدولقـادر ئەفەندی ترابزۆنی بروانامـەی لە دار موعەلمینی دەرسـەعادەت وەرگرتووە و چۆتە موعەلمینی روشـدیەی موسـڵ، دوای سـێ سـاڵ لە نائیبەکانی قەزا ئەرکی وەرگرتووە، زمانی عەرەبی و فارسـی و کـوردی دەزانێـت، ناوبـراو داوای کـردووە لـە بەرێوەبەرایەتـی مەعاریفـی ویلایەتـی موسـڵ دابمەزرێـت، بۆ ئەمەش بـە واژووی ناوبـراو تەلەگرافنامـە لـە موسـڵ دەرچـووە، بـە نـووسراوی ٢ رەبیعـی کۆتایی ١٣١٠ بـۆ دەوڵەت نێـردراوە، لـە دووبارە داواکردنـەوەی لەگـەڵ هەندێـك ووتە کە ئەمجـارە لەلایـەن ناوبـراوەوە داواکاری نێردراوە، بـە هاوپێچ بۆ سـەدارەت رۆیشـتووە، بە تێروانین لە ئاماژە و بابەتی پێشـوو داواکراوە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی کارەکە.
لە ١٨ جەمادی یەکەم ١٣١٠ لە ٢٦ تشرینی دووەم ١٣٠٨
سەدری ئەعزەم و هاوکاری



DH.MKT.01991.00008.001

| 29 موحەررەم 1310 | 01991.00008 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٩ موحەررەم ١٣١٠
١٠ ئۆغستۆس ١٣٠٨
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق عەباس ئەفەندی بۆ ئەوەی پلەکەی بۆ پلەی چوارەم بەرز بێتەوە، ئاماژە بۆ واڵا نێردراوە، دوای وەرگرتنی رەزامەندی بە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا فەرموویەتی، جێبەجێ بکرێت.




DH.MKT.02021.00057.001

| DH.MKT. | 02021.00057 | 26 رەبیعی کۆتایی 1310 |
| --- | --- | --- |

٢٦ رەبیعی کۆتایی ١٣١٠
٤ تشرینی دووەم ١٣٠٨
بۆ نەزارەتی پۆستە و تەلەگرافی عالی
لە ناو ویلایەتی شارەزوور لەبەر گرنگی شوێنی ستراتیژی قەزای کۆی سانجەق و زۆری دانیشتووانەکەی پێویستە هێڵێکی تەلەگراف رابکێشرێت و دروست بکرێت، لەم بارەیەوە بۆ چاندنی دار و پێداویستی تر لەگەڵ خەرجی مەرکەز و هەموو رێکخستنەکانی تر بەڵێن دراوە لەلایەن دانیشتوانی خۆچێییەوە بدرێت، بۆ جێبەجێ کردنی لە ویلایەتی موسڵ تەلەگرافنامە دەرچووە و نێردراوە، وێنەی ئاماژە پێکردنەکە بە تێروانین لە گرنگی بابەتەکە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی کارەکە.



| | | |
|---|---|---|
| 22 شەوال 1311 | 00034.00001 | DH.MKT. |

٢٧ نیسان ١٣٠٩
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
بۆ پاراستنی سەربانەکانی قۆناغی حکوومەتی کۆی سانجەق لە بەفر و باران، مانگانە ٤٠ قوروش مووچە بۆ دوو کەسی خۆچێی دابینکراوە، لەگەڵ ئەمەش لە موازەنە هیچ بەرامبەرێکی نییە، وێنەی پرس و رای دابینکردنەکەی لە نووسراوی مێژووی ١٤ مارت ١٣٠٩ ژمارە ٦ حەواڵەی نەزارەتی ژمێریاری کراوە، خەرجی خێرخوازی قۆناغەکانی حکوومەت لە خەرجی ناو موازەنەی رێکخستنی نۆژەنکردنەوە دابین دەکرێت، خەرجی سەربانەکانی باسکراو لە رێکخستنی باسکراودا رێکخراوە، هەروەها خشتەی خەرجی لە تۆمار و نووسینەوەی پێویستدا بۆ والا نووسراوەتەوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
245 | 18338

BEO.000245.018338.001

| BEO. | 000245.018338 | 10 موحەررەم 1311 |
|---|---|---|

١٠ موحەررەم ١٣١١
١٣ تەمموز ١٣٠٩
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لەسەر فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی کە دەرچووە، بۆ جێبەجێ کردنی، دەفتەری دەرخستە لەگەڵ نەخشەکەی هاوپێچ نێردراوە، لە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلەش داوای هیممەت کراوە.

سەبارەت بە خەرجی درێژکردنەوەی هێڵی تەلەگرافی قەزای کۆی سانجەق.

لە ١٥ تەمموز ١٣٠٩ فەرمانی پاشا دەرچووە.



A.}MKT.MHM.00532.00004.004

| 9 زيلحيجه 1311 | 00532.00004 | A.MKT.MHM. |
|---|---|---|

نەزارەتی کاروباری دارایی
ئەنجوومەنی دارایی
ژمارە ٤٣٠
ڕاگەیەندراوی بەندە
محەمەد شەفیق ئەفەندی فەرمانبەری ڕەژی لە قەزای کۆی سانجەق لەگەڵ هەندێك سەرۆکی خۆچێی ناوچەکە بۆ بەرژەوەندی خۆی و دژی حکوومەت جموجۆڵی پێچەوانە ئەنجام دەدات و هاندەرە بۆ ئەم جۆرە کارانە، وێنەی هەموو کارە خراپەکانی و کاغەزی فەرمی پەسەند کراوە، بۆیە مانەوەی لەوێ باش نییە و لە ویلایەتی موسڵ ئاماژەی پێکراوە ناوبراو لە شوێنی کارەکەی نەهێڵدرێت، بە ئاماژەی ویلایەت و ڕاگەیەندراوی عالی بەپەلە لە خەزینەوە ئاگاداری دراوەتە کارگێری ڕەژی، کە فەرمانەکە هەر ئێستا و بە دووپاتکردنەوە جێبەجێ بکرێت، بە نووسراوی سەدری ئەعزەمی جەنابی وەکالەتپەناهی بە دووبارەکردنەوە ئاگادارکردنەوەی پێشوو بۆ قۆمیسیۆنی کارگێری ڕەژی نێردراوە، ئەمجارە لەو نووسراوەی کە وەرگیراوە بە تەلەگراف نەزارەتی ڕەژیی بەغداد ئاماژەی داوە کە هەر ئێستا ناوبراو لەوێ دەربهێندرێت، بە ڕاگەیەندراوی بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕاگەیەندراوە، وەڵامەکەشی بە ڕاگەیاندن و ئاماژەی سەدری ئەعزەمی جەنابی وەکالەتپەناهی لە ئەنجوومەنی دارایی گفتوگۆی لەسەر کراوە، لەم بابەتە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٩ زیلحیجە ١٣١١ و لە ١ حوزەیران ١٣١٠.
نازری دارایی

| 2 رەبیعی کۆتایی 1312 | 00228.00025 | MF.MKT. |
|---|---|---|

- مۆزەخانەی هومایۆن
ژمارە ١١٧
بۆ نەزارەتی مەعاریفی جەلیلە
جەنابی دەوڵەت
پارچە پەیکەرێك لە قەزای کۆی سانجەق دۆزراوەتەوە و هێنراوەتە موسڵ، لەوێش لەلایەن موسیو شایل نێردراوەتە مۆزەخانەی هومایۆن، بە نووسراو لە ویلایەتی موسڵی جەلیلە بۆ لایەنی عالی نەزارەتپەناهی نووسراوەتەوە، بە تێروانین لەو راپۆرتەی کە بە هاوپێچ نێردراوە، خوێندنەوەی بەندەمان راگەیەندراوە و ئاماژەی پێکراوە نووسراوی ژمارە ٣٢ لە ١٣ ئەیلوول ١٣١٠، لەلایەن جەنابی نەزارەتپەناهی فەرمان دەرچووە و نێردراوە، ئەوەی لە ناوەرۆکی راپۆرتەکەی ناوهاتوو تێگەیشتووین کە ئەو پارچە پەیکەرەی کە باسکراوە لە شوێنەوارە گرنگەکانە، لە کاتی هێنانی بۆ مۆزەخانەی هومایۆن خەرجی گواستنەوەی کە خەرج کراوە لە داهاتی مەعاریف رێك دەخرێت دواتر لە بودجەی کارگێری بەندە رێك دەخرێت و دابین دەکرێت، برەکەی ئاماژەی پێکراوە، هەروەها شوێنەواری ناوهاتوو بە بێ زیان گەیاندن بگەیەندرێتە هومایۆن بۆ ئەمەش نووسراو لە ویلایەتی ناوهاتوو کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢ رەبیعی کۆتایی ١٣١٢ و ١٩ ئەیلوول ١٣١٠.
بەرێوەبەری مۆزەخانەی هومایۆن

- ٦٢
ژمێریاری ٢٠ ئەیلوول ١٣١٠
٢٥٠١
ئەو پارچە پەیکەرەی کە باسکراوە لە گواستنەوەی بۆ دەرسەعادەت، بری خەرجی گواستنەوەکەی لە بەشە داهاتی مەعاریفی خۆچێی دەرسەعادەت دابین دەکرێت، لە بارەی ناردنی سەنەدی وەرگرتنی پارەکە بە نووسراوی ویلایەتی ناوهاتوو نووسراوی ئەم کارە حەواڵەی قەڵەمی نووسین کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
٢٧ ئەیلوول ١٣١٠
واسف بەگ لە ١ تشرینی یەکەم هەمان ساڵ


DH.MKT.00283.00061.001

| 8 رەبیعی یەکەم 1312 | 00283.00061 | DH.MKT. |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆ
لە پاشکۆی کەرکووك، بەکر بەگ خەڵکی بالیسانی سەر بە کۆی سانجەقە، ناوبراو لێبوردنی عالی بۆ دەرچووە، لە دەرسەعادەت برادەری شێخ سەعید ئەفەندی لەسەر ئەو تەلەگرافنامەیەی کە بۆ نەقیبی سلێمانیەی ناردووە، ناوبراو ئەمڕۆ لە خانەی نەقیبی ناوهاتووە، لە بارەی ئەو مامەڵەیەی لەگەڵی دەکرێت لە موتەسەرفیەتی سلێمانیە لە تەلەگرافنامە پرس و رای لەسەر کراوە، هەروەها لە بارەی لێبووردنی ناوبراو لە ویلایەتەوە هیچ زانیاریەکی لەسەر نەدراوە، بۆیە ئاماژە بە مامەڵەکەی رابگەیەندرێت.
لە ٢٨ ئۆغستۆس ١٣١٠
عەزیز والی موسڵ


DH.MKT 293/11

DH.MKT.00293.00011.001

<table>
<tr><td>DH.MKT.</td><td>00293.00011</td><td>2 رەبیعی کۆتایی 1312</td></tr>
<tr><td colspan="3">پلەی سەرعەسکەر<br>قەڵەمی تۆمار<br>208<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>جەنابی ئەفەندم<br>حەفید سەعید ئەفەندی خەڵکی سلێمانیە، لە کاتی چوونی بۆ شەقڵاوە لەسەر هەندێك گەواهیدەر 4000 لیرە کە لەلای بووە لەگەڵ تاقمێك کەلوپەل تالان کراوە و لێی بردراوە، هەروەها لە بارەی ناوبراوانەوە غەدریان لێکراوە، لە بارەی ئەم بابەتەوە چەند جارێك سەردانی حکوومەتیان کردووە، بەڵام بێ سوود بووە، قەزای کۆی سانجەق کە سەر بە سانجەقی شارەزوورە مستەفا و دوو کەس کە خەڵکی شەقڵاوەن، پارچەیەك داواکاری کە بە هەشت مۆری تر مۆر کراوە هاتووە، ئەو هاوپێچەی لەگەڵیەتی بە پۆستە بۆ سەدری ئەعزەم نێردراوە، لەم بابەتە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە 2 رەبیعی کۆتایی 1312 و لە 20 ئەیلوول 1310.<br>رزا سەر عەسکەر</td></tr>
</table>

| 2 رەجەب 1312 | 00303.00037 | DH.MKT. |
|---|---|---|

- 4 جەمادی یەکەم 1312
22 تشرینی یەکەم 1310
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی

لەبەر کارە خراپەکانی عەباس ئەفەندی قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق لە کارەکەی دوور خراوەتەوە و لەسەر فەرمانی پاشای جەنابی پاشا دادگاییەکەی جێبەجێ دەکرێت، بۆ قائیمقامیەتی قەزای ناوهاتووش، محەمەد سەعید ئەفەندی هەڵبژێردراو لە چینی سێیەم کە لە قائیمقامیەتی قزل کلیسا جیابۆتەوە، نووسراو کراوە دەست بە کار بێت، بریارنامە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران ڕێکخراوە و دراوە، هاوپێچ لەگەڵ لاپەرەی زانیاری کەسێتی بەیەکەوە پێشکەش کراوە، لەگەڵ دەرچوونی فەرمانی پاشا سوێند خواردنەکەی جێبەجێ دەکرێت، بۆ جێبەجێ کردن رای جەنابی وەکالەتپەناهییە.

- 2 رەجەب 1312
18 کانوونی یەکەم 1311
بۆ ویلایەتی موسڵی جەلیلە

سەرەتا بە تەلەگرافنامە ئاماژەی پێکراوە کە لە قەزای کۆی سانجەق وەکو قائیمقام دامەزرێت، محەمەد سەعدی ئەفەندی لەگەڵ گەیشتنی بۆ شوێنی کارەکەی و مێژووی دەست بە کاربوونی بە گوێرەی نووسراو مانگانە ١٢٥٠ قوروش مووچەی بۆ دابین دەکرێت، لە راگەیاندنی مێژووەکانی دەست بەکاربوون و دەست لە کارکێشانەوەی هەروەها مووچەی دوورخراوانی ناوبراو ١٠٩٤ قوروشە، جگە لەمەش بە پێی بریارەکانی نیزام ٢٠٨٨ قوروش خەرجی رێگای هەیە، بە گوێرەی رێسا و بنەما لە دارایی ناوەخۆ رێك بخرێت و لە خشتەی خەرجی تۆمار بکرێت، بۆ ئەمەش نووسراو بۆ دەوڵەت کراوە و حەواڵە کراوە، لە نەزارەتی ژمێریاریش گفتوگۆی لەسەر کراوە، بە گوێرەی ئەوانە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

بۆ نەزارەتی سندوقی مولکیەی خانەنشینانی جەلیلە

محەمەد سەعدی ئەفەندی لە قائیمقامیەتی قزل کلیسا دوورخراوەتەوە، لە مێژووی ٢٩ جەمادی کۆتایی ١٣١٢ بریار دراوە کە لە ناو ویلایەتی موسڵ لە قائیمقامیەتی قەزای کۆی سانجەق دامەزرێت، ناوبراو لە مووچەی دوورخراواندا لە مێژووی نووسراودا مامەڵەکەی جێبەجێ دەکرێت، بۆ ئەمەش نوسراوی بەندەمان بە پەلە نووسراوەتەوە.




| 26 جەمادی یەکەم 1312 | 00311.00041 | DH.MKT. |
| --- | --- | --- |

٢٦ جەمادی یەکەم ١٣١٢
١٣ تشرینی دووەم ١٣١٠
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
لە ناو سانجەقی کەرکووك، خولەفای تەریقەتی نەقشبەندی نیشتەجێی شارۆچکەی کۆی سانجەقە، خوالێخۆشبوو حاجی عومەر ئەفەندی زادە حاجی ئەسعەد ئەفەندی لە شارۆچکەی ناوهاتوو خانقاکەی وێران بووە، هەروەها بە خۆی لەو زانایانەیە کە شایانی میهرەبانیە جیگەی سەدەقەی جەنابی خەلافەتپەناهیە، لە بارەی برینەوەی مووچەیەکی دیاریکراو، نووسراو لە مێژووی ١٨ ئەیلوول ١٣١٠ ژمارە ١١١ لە ویلایەتی موسڵ هاوپێچ بەیەکەوە پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی ئەمر و فەرمان.




| DH.MKT. | 00334.00019 | 8 جەمادی یەکەم 1312 |
| --- | --- | --- |

موتەسەرفیەتی کەرکووك
٥٩٨
بۆ جەنابی ویلایەتپەناهی
جەنابی ئەفەندم

ئەو داواکاریەی کە لە ئاڵای ٣١ لەلایەن میری ئاڵای پێشکەشی جەنابی ویلایەتپەناهی کراوە، هاوپێچ فەرمانامەی عالی خدێوانە لە ١٩ تشرینی یەکەم ١٣١٠ فەرمان و ئاماژەی پێکراوە، لە کاتی حەواڵە کردنی دە یەك کە من لەوێ ئامادە بووم، سەرۆکی شارەوانی قەزای کۆی سانجەق سادق ئاغا هەوڵ و کۆششی زۆر داوە و هاوکاری سەربازی شاهانەی کردووە لە گواستنەوە و ئامادەکاریەکاندا، هەروەها لە زیادکردنی دە یەکدا دڵسۆزی و نەرم و نیانی هەبووە جگە لەمەش لە لقی ئاوی رۆیشتووی مەملەکەتدا لە نۆژەنکردنەوە و خاوێن کردنەوەی خزمەتی باشی کردووە، بۆیە لە قائیمقامیەتی ناوەخۆ کارەکان کۆتایی پێ هاتووە، ئاغای ناوبراو بە پلەیەکی گونجاو لەگەڵ نیشانێك رێزی لێ بگیرێت، هەر رایەك بۆ جەنابی خدیوانەی پایەبەرزە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٨ جەمادی یەکەم ١٣١٢ و لە ٢٥ تشرینی یەکەم ١٣١٠.
عوسمان ژمێریاری وەکیلی موتەسەرفی کەرکووك



DH.MKT.00354.00020.002

| .DH.MKT | 00354.00020 | 1 رەمەزان 1312 |
| --- | --- | --- |

نەزارەتی کاروباری دارایی
ئەنجوومەنی دارایی
ژمارە ١١٨٣
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
جەنابی ئەفەندم
لە پاشکۆکانی ویلایەتی موسڵ، بەڕێوەبەری ڕەژیی قەزای کۆی سانجەق کاتێك بە شەو لە پەنجەرەی ئەو ژوورەی کە لێی دانیشتووە دوو جار فیشەکی بۆ تەقێندراوە، لەگەڵ خانەوادەکەی تووشی مەترسی بۆتەوە، بۆ ئەوەی بوێری کەران تەمبێ بکرێن، بە ڕێگەی قۆمیسیۆنی بەڕێوەبەرایەتی گشتی نووسراوی ڕاگەیاندن نێردراوە، بە ووتەی ئەنجوومەنی دارایی هاوپێچ پێشکەش کراوە، بەم تێروانینە بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١ رەمەزان ١٣١٢ و لە ١٤ شوبات ١٣١٠.
نازری دارایی



BEO.000430.032219.002



BEO.000430.032219.001

| BEO. | 000430.032219 | 1 موحەررەم 1312 |
|---|---|---|

- ٢٣ حوزەیران ١٣١٠

بۆ ویلایەتی بەغداد

هاوپێچی تەلەگرافنامەی ٥ حوزەیران ١٣١٠، نورەددین و برادەری ئیبراهیم بەرگەی ساردی کۆی سانجەقیان نەگرتووە، لە کەرکووک نیشتەجێ بوونە و بە تەلەگرافنامە داوایان پێشکەش کردووە، بۆ نیشتەجێ کردنیان لە موسڵ، بۆ ویلایەتی موسڵ نووسراو کراوە.

شیفرە

بۆ ویلایەتی موسڵ

لەبەر ئەوەی لە حلە ئاسایشی حلەیان تێك داوە، بۆ شارۆچکەی کۆی سانجەق دوورخراونەتەوە، لە رۆژانی رابردوو بۆ ویلایەتی بەغداد ئاماژە نێردراوە، نورەددین و برادەری ئیبراهیمی شیعە، بەرگەی ساردی ئەو ناوچەیە ناگرن، لە کەرکووك بە تەلەگرافنامە داوای میهرەبانیان کردووە، بە گونجاو زانراوە کە لە موسڵ نیشتەجێ بکرێن و داواکراوە رێگە نەدرێت لەوێیەوە بۆ شوێنی تر رابکەن، زانیاری دراوەتە ویلایەتی بەغداش.

- بۆ سەرۆکایەتی شورای دەوڵەتی جەلیلە

جەنابی حەق و شان ملوکانە فەرموویەتی، بە گوێرەی توانا ئەو فەرمانەی پێمان دراوە، گوێرایەڵی بووینە و لە حلە چووینەتە کەرکووك، هەر خۆی ئاگادارن لەبەر قورسی نەخۆشەکەم، رۆژ لە دوای رۆژ نەخۆشیەکەم قورستر دەبێت، بە فەرمانی پاشا چارەسەرم بۆ دەکرێت، ئەوەی گوێ بیست بووین وڵاتی کۆی سانجەق ساردە و مەملەکەتی منیش گەرمە، بۆیە بە ماوەیەکی کەم هیلاك دەبم، لەبەر ئەوە بە بەزەیی جەنابی پاشا پارێزگاری لە ژیانمان بکرێت، فەرمان بدرێت لە کەرکووك نیشتەجێ بین، بۆ ئەمەش بە دڵ فراوانیەوە تکا دەکەین.

خەڵکی حلە حەمزە ئاغازادە نورەددین و
ئیبراهیمی برادەری




| 3 رەبیعی یەکەم 1312 | 000482.036108 | BEO. |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ١٩٥١
جەنابی سەدارەتپەناهی
راگەیەندراوی بەندەیە
لە پاشکۆی سانجەقی کەرکووك، سەبارەت بە کارە خراپەکانی قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق عەباس ئەفەندی، لە شوێن خۆیدا لە رێگەی فەرمانبەری تایبەتەوە لێکۆڵینەوە ئەنجام دراوە، کاغەزی لێکۆڵینەوەکان نێردراوە، نووسراو لە ویلایەتی موسڵ نێردراوە، لە ١٣ کانوونی دووەم ١٣٠٩ نووسراو پێشکەش کراوە، لەسەر دووپاتکردنەوەی ئەمجارە لە ویلایەتی ناوهاتوو تەلەگرافنامە لە ٤ ئۆغستۆس ١٣١٠ دەرچووە، لەگەڵ هاوپێچ پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی بە هاوکاری جەنابی سەدارەتپەناهی، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٣ رەبیعی یەکەم ١٣١٢ و لە ٢٢ ئۆغستۆس ١٣١٠.
راوێژکاری نەزارەتی ناوەخۆ




<table>
<tr><td>BEO.</td><td>000492.036893</td><td>9 ڕەبیعی کۆتایی 1312</td></tr>
<tr><td colspan="3">٢٩ ئەیلوول ١٣١٠<br>بۆ ویلایەتی بەغدادی جەلیلە<br>بەهۆی ئەوەی ئاسایشی حلەیان تێك داوە، لەسەر تەلەگرافنامەی دەوڵەت لە مێژووی ٣١ مایس ١٣١٠ بۆ شارۆچکەی کۆی سانجەق دوورخراونەتەوە، بەم دواییە بەرگەی ساردی ناوچەکەیان نەگرتووە، لەگەڵ ئەو تەلەگرافنامەیەی کە ڕایانکێشاوە و لەسەر داواکاری خۆیان شوێنی نیشتەجێ کردنیان گوازراوەتەوە موسڵ، لەسەر مەزهەبی شیعە نورەددین و ئیبراهیمی برادەری بە بەزەییەوە ڕەفتاریان لەگەڵ کراوە، لە وەڵامی پرس و ڕای پێشوو کە ڕۆیشتووە، لە ویلایەتی موسڵ تەلەگرافنامە ڕۆیشتووە، لەبەر ئەوەی نورەددین نەخۆشی سینگی هەیە، پێویستە لە موسڵ لە ناوچەکەیەکی گەرمتر نیشتەجێ بن، ئەمەش بە ڕاپۆرتی دەستەی تەندروستی ڕاگەیەندراوە، لەبەر گرنگی زانیاریەکان و پەرێشان بوونی خانەوادەکەی، ئەمجارە دوو تەلەگرافنامە بۆ عالی نێردراوە تێدا ناوبراوان داوایان کردووە ڕێگە بدرێت لە ڕێگەی ڕووبارەوە بچنە بەغداد، دوای خوێندنەوە بۆ دەوڵەت نووسراو کراوە هیممەت بکرێت.</td></tr>
</table>


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
500 37451

<table>
<tr><td>BEO.</td><td>000500.037451</td><td>17 ڕەبیعی کۆتایی 1312</td></tr>
<tr><td colspan="3">١٧ ڕەبیعی کۆتایی ١٣١٢<br>بۆ ویلایەتی موسڵی جەلیلە<br>لە هۆزەکانی قەزای کۆی سانجەق، بەکر بەگ مامی سەرۆکی پێشووی هۆزی میر یوسفی، هەر لە کۆنەوە بە کاری چەتەیی ناوبانگی دەرکردووە، چەند ساڵ لەمەوبەر برادەری خۆی کوشتووە، ئەمجارەیان باوکی سەرۆکی هۆزی ناوهاتوو ئەحمەد بەگی لە سێدارە داوە، هۆزەکە پەنای بۆ خدر بەگ، سەرۆکی هۆزی پشنکلی لە پاشکۆی قەزای رانیە بردووە، هەروەها ناوبراو لە بارەی ئەندامانی خانەوادەی ترەوە مامەڵەی خراپ و مەبەستی خراپەکارانەی جێبەجێ کردووە، لەم بارەیەوە ئەو کارانەی ئەنجام دراون، هێشتا ئەنجامی نەبووە، لەسەر هەژمار و هەندێك ووتە بە واژوو و مۆری ئیسماعیل زوهدی ئەفسەری پۆلیسی سێیەمی سانجەقی زور، داواکاری هاتووە، هاوپێچ بۆ دەوڵەت نێردراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە هیممەت بکرێت لە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە.</td></tr>
</table>




| BEO. | 000527.039511 | 4 رەبیعی کۆتایی 1312 |
| --- | --- | --- |

٤ رەبیعی کۆتایی ١٣١٢
بۆ ویلایەتی موسڵی جەلیلە
لە هۆزەکانی قەزای کۆی سانجەق، بەکر بەگ مامی سەرۆکی پێشووی هۆزی میر یوسفی، هەر لە کۆنەوە بە کاری چەتەیی ناوبانگی دەرکردووە، چەند ساڵ لەمەوبەر برادەری خۆی کوشتووە، ئەمجارەیان باوکی سەرۆکی هۆزی ناوهاتوو ئەحمەد بەگی لە سێدارە داوە، هۆزەکە پەنای بۆ سەرۆکی هۆزی پشنکلی خدر بەگ لە پاشکۆی قەزای رانیە بردووە، هەروەها ناوبراو لە بارەی ئەندامانی خانەوادەی ترەوە مامەڵەی خراپ و مەبەستی خراپەکارانەی جێبەجێ کردووە، لەم بارەیەوە ئەو کارانەی ئەنجام دراون، هێشتا ئەنجامی نەبووە، لەسەر هەژمار و هەندێك ووتە بە واژوو و مۆری ئیسماعیل زوهدی ئەفسەری پۆلیسی سێیەمی سانجەقی زور، داواکاری هاتووە، بۆ جێبەجێ کردنی لە ٢٢ رەبیعی کۆتایی ١٣١٢ بۆ دەوڵەت نێردراوە، لە وەرگرتنی کارەکە هێشتا جێبەجێ کردنەکەی دەستی پێ نەکردووە، هەروەها بە گوێرەی هەموو ووتەکان ئەمجارە لەلایەن ناوبراوەوە داواکاری هاتووە هاوپێچ بۆ عالی نێردراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە و ئاماژەی پێشوو پێویستە هیممەت بکرێت لە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە و ئەنجامی کۆتایی بدرێت.




| BEO. | 000528.039555 | 2 جەمادی کۆتایی 1312 |
| --- | --- | --- |
| ٢ جەمادی کۆتایی ١٣١٢<br>٢٠ تشرینی دووەم ١٣١٠<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>لە ناو ویلایەتی موسڵ بۆ قائیمقامیەتی قەزای کۆی سانجەق محەمەد سەعدی ئەفەندی کە لە قائیمقامیەتی قزل کلیسا جیابۆتەوە و فەرمانی سوێند خواردنەکەی خەریکە ئەنجام دەدرێت، لە بارەی دامەزراندنیشیەوە نووسراوی رەزامەندی مێژووی ٤ جەمادی یەکەم ١٣١٢ ژمارە ٢٧٨١ و فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی لە مێژووی ٢٩ جەمادی یەکەم ١٣١٢ فەرموویەتی هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی کارەکە. | | |




| BEO. | 000529.039639 | 9 جەمادی یەکەم 1312 |
|---|---|---|

ویلایەتی بەغداد
ژمارە ٣٦
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
راگەیەندراوی بەندەیە

لەبەر ئەوەی لە حلە ئاسایشیان تێك داوە، پێشەكی بۆ حلە دوورخراونەتەوە، دوا جاریش شوێنەكەیان گۆڕیوە بۆ موسڵ ڕۆیشتوون، بەڵام لەسەر مەزهەبی شیعە نورەددین و ئیبراهیم داواكاریان ناردووە و تكایان كردووە بگەڕێنەوە بەغداد، لەم بارەیەوە دوو پارچە تەلەگرافنامە هاوپێچ خوێندراوەتەوە و فەرمانی راگەیاندن و ئاماژە پێكردنی لە ٢٩ ئەیلوول ١٣١٠ ژمارە ٢٤ فەرمانناممەی سەدری ئەعزەمی جەنابی وەكالەتپەناهی خوێندراوەتەوە و سەرەتا راگەیەندراوە، بە گوێرەی خوێندنەوەكە ئەوانە لە كەسانی تێكدەر و ئاژاوەچین، لە رابردوو بە گوێرەی ئەو ئاژاوەیەی كە یەك لە دوای یەك لە حلە كردوویانە، بۆتە هۆی ئەوەی لە نێوان سوننە و شیعەكان ناكۆكی دروست بێت، بە دوورخستنەوەیان ئارامی گشتی و ئاسایش بەرقەرار بووە و گەندەڵی كۆتایی پێ هاتووە، ئێستا ئەوانە بگەڕێنەوە بەغداد ئەوە ئاسایش و ئەمنیەتی ناوچەكە تێك دەچێتەوە، ئەمەش لەلایەنی سیاسیەوە پێچەوانەیە و گونجاو نییە، راگەیەندراوە و لەم بارەیەوە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئە و كەسەیە كە فەرمان دەردەكات.

لە ٩ جەمادی یەكەم ١٣١٢ و لە ٢٧ تشرینی یەكەم ١٣١٠
حەسەن رەفیق والی بەغداد




| BEO. | 000541.040535 | 27 جەمادی کۆتایی 1312 |
|---|---|---|

٢٧ جەمادی کۆتایی ١٣١٢
١٥ کانوونی یەکەم ١٣١٠
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
لـە نـاو سـانجەقی کەرکـووك لـە خەلیفەکانی تەریقەتی نەقشـبەندی نیشـتەجێی شـارۆچکەی کۆی سـانجەق حاجی ئەسـعەد ئەفەندی شـایەنی بەزەییە، بۆ ئەم زانایە برێکی گونجاو مووچە دابین بکرێت، بۆ ئەم مەبەسـتە لە ویلایەتی موسـڵ نـووسراو نێـردراوە، هاوپێـچ نـوسراو لـە نەزارەتـی ناوەخـۆی جەلیلـە هاتـووە، لە مێـژووی ٥ جەمـادی کۆتایی ١٣١٢ بـە نـووسراو رەوانـی دەوڵـەت کراوە، بەهۆی پێویسـتی بە هەندێك ووتـە و داواکاری بەزەییانە ئەمجارە لەلایەن ناوبـراوەوە داواکاری دراوە، هاوپێـچ دراوەتـە سـەروو، بە تێروانین لـە بابەتەکە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.


İ.DH 1317/1312.Ca/44
57

İ.DH.01317

| 4 جەمادی یەکەم 1312 | 01317.000057 | I.DH. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٢٧٨١
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
راگەیەندراوی بەندەمانە

قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق عەباس ئەفەندی لەبەر خراپەکاریەکانی دوور خراوەتەوە، لەسەر فەرمانی پاشای جەنابی پاشا دادگاییەکەی جێبەجێ دەکرێت، بۆ قائیمقامیەتی ناوهاتوو لە قائیمقامیەتی قزل کلیسا محەمەد سەعدی ئەفەندی هەڵبژێردراو لە چینی سێیەم نووسراوی بۆ کراوە بۆ ئەوەی ئەرکەکەی جێبەجێ بکات، لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران بریارنامە رێکخراوە و دراوە، هاوپێچ لەگەڵ کاغەزی زانیاری وەرگێردراو بەیەکەوە دوای پێشکەش کردنی فەرمانی پاشا جەنابی وەکالەتپەناهی رای لەسەر بێت جێبەجێ دەکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٤ جەمادی یەکەم ١٣١٢ و ٢٢ تشرینی یەکەم ١٣١٠
نازری کاروباری ناوەخۆ




مقام سرعسکری

مکتوبی قلمی

خصوصی

Y. MTV

129/134

Y.MTV.00129.00134.001

| | | |
|---|---|---|
| I.MVL. | 00419.018342 | 20 رەبیعی کۆتایی 1313 |

پایەی سەر عەسکەر
قەڵەمی نووسین
تایبەتی

لە ناو قەزای کۆی سانجەق بەکر بەگ لەگەڵ هاوەڵانی خەریکی کاری چەتەییە، دوای بەدواداچوون دەستگیر کراوە، لە ویلایەتی موسڵ بە سەربازی پاراستن و هێزی پاڵپشت دەردەهێنرێت، ناوبراو لە قەڵا پێویستی بە کڕین و فرۆشتن بووە، بۆیە بە شێوەیەکی کاتی لە قەڵا نیشتەجێ بوونە، بەم شێوەیە رێگە نەدرێت لە قەڵا بمێنێتەوە و خۆی لەوێ قایم بکات، بۆیە لە ویلایەتی ناوهاتوو بەدواداچوون کراوە، لە کۆی سانجەق بلۆکێك لە تابوری چوارەمی ئالای ٤٦، لەگەڵ ئەفسەرێکی لێهاتوو ئەم ئەرکەیان پێ بدرێت، بۆ ئەم مەبەستە ئاگاداری دراوەتە قوماندانیەتی فرقەی ١٢، بە گوێرەی ئەو زانیاریەی کە وەردەگیرێت، ژمارەی بلۆکەکە و ناوی ئەفسەرەکە رادەگەیەندرێت، ئەو تەلەگرافنامەیەی کە لە موشیرەتی جەلیلەی لەشکری شەشەمی هومایۆن هاتووە و بۆ فەرمانگەی ئەرکانی گشتی جەنگی نێردراوە، تێدا زانیاری نووسراوەتەوە، لەسەر فەرمانی عالی زانیاریەکان بەپەلە راگەیەندرا، لەم بابەتە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەفەندمە.
لە ٢٠ رەبیعی کۆتایی ١٣١٣ و لە ٢٨ ئەیلوول ١٣١١.
رزا سەر عەسکەر


İ.HB.00173.00017.003

| 1333 شەوال 6 | 00173.00017 | I.HB. |
|---|---|---|

نەزارەتی جەنگی
فەرمانگەی تۆمار
٩٩٩
فەرمانی پاشا
لە قەزای کۆی سانجەق، بەقال سەعید کوڕی ئەحمەد و هاوەڵانی، مامەڵەی بەزۆرەملی و توندوتیژیان ئەنجام داوە، ئەو ژاندارمانەی بۆ دەستبەسەرداگرتنی کەلوپەکان و دەستگیرکردنیان رۆیشتوون، لە بەرامبەریاندا چەکیان بەکارهێناوە، لەوانە حوسێن کوڕی ساقی بریندار بووە، لە کاتی دادگاییدا پشت راست کراوەتەوە، لەوانە حەمە لە گوندی شیلە و رەشید کوڕی کوخە کەریم هەروەها کوڕەکانی ئیبراهیم بە ناوی ئەسعەد و باقی بە گوێرەی یاسایی سزای مولکیە ماددەی ٢٥٢ هەر یەکە بە ٣ ساڵ و نیو بە سزای سەوڵ لێدان زیندانی دەکرێن، لە هەر یەکەشیان ٥ مەجیدی زێر وەکو سزا لێیان وەردەگیرێت، لە بارەی حەمە و رەشیدیش رووبەروو ئەوانی تریش بە بێ ئامادە بوون ئەو بریارەی لە دیوانی جەنگی عورفی موسڵ لەسەریان دەرچووە پەسەند کراوە.

بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا نازری جەنگی ئەرکی پێ سپێردراوە، لە ٦ شەوال ١٣٣٣ لە ٤ ئۆغستۆس ١٣٣١.
وەکیلی باش قوماندان و نازری جەنگی
سەدری ئەعزەم

DH.ŞFR.00176.00026.001

| 24 موحەررەم 1313 | 00176.00026 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لە مێژووی ١٨ حوزەیران ١٣١١ ژمارە ٥٥ نووسراوی نەزارەتپەناهی راگەیەندراوە، بۆ دەستگیرکردنی چەتە بەکر بەگی کۆی سانجەق، یەك تابوری سەربازی شاهانە لە مەرکەزی قەزا بوونی هەیە، وەکو هێزی پاڵپشت لەگەڵ پۆلیسی پاراستن کارەکە ئەنجام بدەن، ئەگەرچی سەرەتا تەلەگرافنامەی بە وەکالەتپەناهی راگەیەندراوە، بەڵام بۆ ناردنی سەربازی شاهانە داوای هاوکاری نەکراوە، لە بەرامبەر کاری چەتەیی و ئەو تاوانانەی کە ئەنجامی دەدات، هەرچی زووە رێگەی لێ بگیرێت و لەسەر ئاماژەی پێشوو بە پەلە فەرمان بدرێتە سەربازی پاراستن کە وەکو هێزی پاڵپشتە لەگەڵ ئەو تابورەی کە لە ناو مەرکەزی قەزای ناوهاتووە، راگەیەندراوە فەرمان، لە ٥ تەمموز ١٣١١.
عەزیز والی موسڵ


DH.ŞFR.00188.00007.001

| | | |
|---|---|---|
| DH.ŞFR. | 00188.00007 | 3 ڕەمەزان 1313 |

نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
توندرەوەکانی شارۆچکەی کۆی سانجەق لە نێوان خەڵك فتنە و گەندەڵی دروست دەکەن، هەروەها بوێری دەکەن شۆرش بەرپا بکەن، چەتە ڕەسوڵ عەلی ئەحمەد قادر و مەجید ئاغا ئەگەر بکرێت بهێنرێنە مەرکەزی ویلایەت، بۆ هەموو لایەك دەبێتە جێگەی وورپابوونەوە، لەگەڵ میری ئالا مستەفا نافز بەگ لە هێزی بەدواداچوون گفتوگۆ کراوە لە ئەنجامی ئەو گفتوگۆیە، ئەگەر بە شێوەیەکی گونجاو نەکرێت، ئەوا بە هێزی زۆرەملێ ڕەوانی مەرکەزی ویلایەت بکرێن، بۆ قوماندان و موتەسەرفیەتی کەرکووك نووسراوەتەوە، بە مەبەستی زانیاری ڕاگەیەندراوە، فەرمان، لە ٤ شوبات ١٣١١.
ساڵح والی موسڵ



DH.MKT.00199.00029.001

| DH.MKT. | 00199.00029 | 5 سەفەر 1313 |
| --- | --- | --- |

- ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٧٤
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
جەنابی ئەفەندم
بە دوورخستنەوەی قائیمقامی پێشووی قەزای کۆی سانجەق عەباس ئەفەندی و لە بارەی جێبەجێ کردنی دادگاییەکەی بە ڕەزامەندی فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی لەگەڵ نووسراوی ٢٨ ئەیلوول ١٣١٠ ئاگاداری نێردراوە، لە وەڵامدا نووسراوی نەزارەتپەناهی لە مێژووی ١٤ حوزەیران ١٣١١ ژمارە ٦٤ فەرمان و ئاماژە نێردراوە، هەروەها لە بارەی ناوبراو سەرەتا کاغەزی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە پێشکەش کراوە، هێشتا نەنێردراوەتەوە، لەم بارەیەوە ئەوەی پەیوەستە بە دادگاییەکە ئەوا لەسەر هاتنی کاغەزەکانی لێکۆڵینەوە وەستاوە، فەرمان دراوە پێویستە زوو بنێردرێتەوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٥ سەفەر ١٣١٣ و لە ١٥ تەمموز ١٣١١
والی موسڵ

- ١٧ ڕەجەب ١٣١١
١٣ کانوونی دووەم ١٣٠٩
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
لە پاشکۆی سانجەقی کەرکووك قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق عەباس ئەفەندی لە بەر کارە خراپەکانی لە شوێن خۆی بە زانیاری فەرمانبەری تایبەت لێکۆڵینەوە ئەنجام دراوە، کاغەزی لێکۆڵینەوەکانی ناردووە، لەگەڵ پێشکەش کردنی نووسراوەکانی ویلایەتی موسڵ لە مێژووی ١٨ کانوونی یەکەم ١٣٠٩ ژمارە ١٥٧، بە هاوکاری جەنابی سەدارەتپەناهی جێبەجێ دەکرێت.

DH.MKT.00391.00022.001

| DH.MKT. | 00391.00022 | 6 موحەڕڕەم 1313 |
|---|---|---|
| ٦ موحەڕڕەم ١٣١٣<br>١٧ حوزەیران ١٣١١<br>بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی<br>خانەدانی کۆی سـانجەق ڕەسـول ئاغا لەگەڵ کوڕەکەی یەحیا ئەفەندی بەڵێنیان داوە جلی سـەربازی شـاهانەی موسڵ دابیـن بکـەن، بـۆ ئەم خزمەتە باشـەیان بۆ هەر یەکە لە پلەی پێنجەم یەك پارچە نیشـانی مەجیدی نیشـان ڕێزیان لێ بگیرێـت، بـۆ ئەم مەبەسـتە لە ویلایەتی موسـڵ لە مێـژووی ٢٠ مایـس ١٣١١ نووسراو بە هاوپێچەوە پێشـکەش کراوە. | | |



| | | |
|---|---|---|
| 8 سەفەر 1313 | 00404.00076 | DH.MKT. |

٨ سەفەر ١٣١٣
١٨ تەمموز ١٣١١
بۆ لایەنی والی جەنابی سەر عەسکەریمان
ئەحمەد بەگ و فەتاح بەگ و قادر بەگ و کورەکەی ئەحمەد بەگ لە ناحیەی پەشەنکلی نیشتەجێن، لەگەڵ پیاوەکانیان بەیەکەوە لە کۆی سانجەق لە گوندی زانا عەبدوڵڵا ئەفەندی سەرپێچیان کردووە و کەلوپەل و پارەوپولیان تالان کردووە و هێرشیان کردۆتە سەریان، ماڵەکانیان سووتاندووە، تاوانی پیاو کوشتنیان ئەنجام داوە، ئەوانەی بوێری ئەوەیان کردووە ئەو کارە تێکدەرانە بکەن، هەروەها بۆ ئەوەی ئاسایشی ناوچەکە بەرقەرار بکرێت، ئەو تابورەی کە لە کۆی سانجەقە بۆ گوندی بێتواتە کە سەر بە هۆزی پەشەنکیە بروات، لە موشیرەتی جەلیلەی لەشکری شەشەمی هومایۆن ئاماژەی پێکراوە، پێویستە فەرمانی جێبەجێ کردن بدرێتە موشیرەتی ناوهاتوو بۆ ئەمەش تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵی جەلیلە دەرچووە و هاوپێچ پێشکەش کراوە، بە تێروانین لەم بابەتە جێبەجێ کردنی بە هاوکاری سەر عەسکەریمان دەبێت.


BEO.000700.052485.003

| | | |
|---|---|---|
| 17 جەمادی یەکەم 1313 | 000700.052485 | BEO. |

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵ بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە نێردراوە
بەهۆی ئەو ناکۆکیەی لە نێوان هۆزەکانی قەزای کۆی سانجەق و قەزای رانیەدا هەیە، کاروباری حکوومەتی بە تەواوەتی پەکخستووە، ئەگەرچی دەست کراوە بە چاککردنەوەی ئەو بارودۆخە و ئامادەکاریەکان دەستی پێکردووە، بەڵام سنووربەزێنەرەکانی شارۆچکەی کۆی سانجەق رەسوڵ ئاغا و حەمە ئاغا، بەردەوام سوود لە تێکدان و ئاژاوەی هۆزەکانی ناوهاتوو وەردەگرن، ئەمەش وا دەکات کۆسپ و تەگەرە بخاتە بەردەم چاکسازیەکان، بۆیە ئەوانە بە شێوەیەکی کاتی تا کارەکان تەواو دەبن بنێردرێنە موسڵ بۆ ئەمەش داوای مۆڵەت کراوە، تکایە فەرمان، لە ١٢ تشرینی یەکەم ١٣١١.
محەمەد ساڵح



| 1313 شەوال 8 | 000760.056944 | BEO. |
|---|---|---|

جەنابی ئەفەندم

لە نێوان کەرکووك لەگەڵ کۆی سانجەق بۆ گواستنەوەی ئەمانەت و کەلوپەل ئۆفیسی گواستنەوە دابین بکرێت بۆ ئەمەش مانگانە ٢٥٠ قوروش بدرێت، بە ئاگاداری حکوومەتی خۆچێی هێنان و بردنی پۆستە بە کەفالەت بە بری دیاریکراوی عانە رێك بخرێت، بە مەبەستی خەرج کردنیشی نەزارەتی پۆستە و تەلەگرافی بەهیە راگەیاندنی حەواڵەی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە کراوە، بریارنامەی فەرمانگەی ناوەخۆی شورای دەوڵەت راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتە بە هەر شێوەیەك بێت ئەگەر فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی چ بفەرموویت، جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم، لە ٨ شەوال ١٣١٣ و لە ١١ مارت ١٣١٢.

رەفعەت سەدری ئەعزەم




<table>
<tr><td>16 زیلقەعدە 1313</td><td>000772.057861</td><td>BEO.</td></tr>
<tr><td colspan="3">١٦ زیلقەعدە ١٣١٣<br>١٧ نیسان ١٣١٢<br>نووسراو بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە<br>لە سانجەقی کەرکووك دانیشتوی کۆی سانجەق فاروق زادە محەمەد لامع بەهۆی هەژاری و زۆری منداڵ سەرەتا ١٠٠ قوروش مووچەی بۆ براوەتەوە، بەڵام لەبەر خراپی بژێوی ژیانی ئەم برە پارەیە بەشی ناکات، بۆیە داوای کردووە بۆی زیاد بکرێت، هاوپێچ داواکاری بە واژوو و مۆری ناوبراو بۆ دەوڵەت نێردراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.</td></tr>
</table>



| BEO. | 000779.058363 | 29 زیلقەعدە 1313 |
|---|---|---|

٢٩ زیلقەعدە ١٣١٣
٣٠ نیسان ١٣١٢
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
وێنەی بریارنامەی فەرمانگەی ناوەخۆی شورای دەوڵەت ژمارە ٥٦٦

بریارنامەی ٧ زیلقەعدە ژمارە ٥٠٤ کە لە نەزارەتی ناوەخۆ حەواڵەی شورای دەوڵەت کراوە، لە فەرمانگەی ناوەخۆش خوێندنەوەی بۆ کرا.

لە بابەتی قەزای کۆی سانجەق لەبەر ئەوەی بارانێکی زۆر باریوە قۆناغی حکومەت وێران بووە، بۆیە بە مانگانەی ٥٠ تا ٣٥ قوروش خانەیەکی دوو دەرگا بە کرێ گیراوە، دوای ئەوەی بۆتە قۆناغی حکومەت بۆ خەرج کردنی برە پارەی ناوهاتوو و وەرگرتنی رەزامەندی لە ویلایەتی موسڵ کۆتایی پێ هاتووە، هەروەها برە پارەی ناوهاتوو لە ناو موازەنەی ناوەخۆ بە هیچ بەرامبەرێك نەنووسراوەتەوە، لە خەرجی ساڵی ٣١١ خەرج نەکراوە، بۆیە لە موازەنەی ئەم ساڵەدا رێك دەخرێت واتە لە ساڵی ٣١٢ دەخرێتە ناو موازەنە و تۆمار دەکرێت، بە حەواڵە کردنی بۆ نەزارەتی دارایی و بە پێویست زانراوە زانیاریش لە نەزارەت بدرێت، بە گوێرەی بەرژەوەندی بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە نووسراو حەواڵەی نەزارەتەکانی ناوەخۆ و دارایی کراوە، بەم بابەتە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٣ زیلقەعدە ١٣١٣ و لە ٢٤ نیسان ١٣١٢.




<table>
<tr><td>1313 شەوال 25</td><td>02073.00097</td><td>DH.MKT.</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>قەڵەمی ژمێریاری<br>یەکەی ............<br>ژمارە ٢٦٦٩<br>لە قەزای کۆی سانجەق مانگانە ٨٥ قوروش بۆ بە کرێ گرتنی خانەیەکی دوو دەرگا خەرج کراوە، بەمەش بۆتە قۆناغی حکوومەت و لە تەلەگرافنامە راگەیەندراوە، وێنەی ئاماژە پێکردنەکە لە کاتی قەبوڵ کردن و دانانی نرخەکەی لە ناو موازەنەدا بەرامبەر بە نەبوونی شوێنگرەوە، پارەی ناوهاتوو بە هەژمار کردن لە خەرجی ساڵی ٣١١ خەرج کراوە، لە موازەنەی ئەم ساڵە تۆمار کراوە، بەڵام لەبەر داخستنی خەرجی ئەم ساڵە، لە موازەنەی ساڵی ٣١٢ بە دواوە تۆمار دەکرێت و مامەڵەکە جێبەجێ دەکرێت لەم بارەیەوە لە نەزارەتی دارایی جەلیلە و فەرمان و ئاماژەی لایەنی عالی تەلەگرافنامەی ناوهاتوو هاوپێچ پێشکەش کراوە، بە فەرمانی جەنابی سەدری ئەعزەمی سەدارەت نووسراو دەکرێت، لەم بابەتە فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٨ مارت ١٣١٢.<br>بە ناوی ژمێریاری</td></tr>
</table>



| 1311 شەعبان 14 | 00008.00094 | DH.MKT. |
|---|---|---|

نەزارەتی کاروباری دارایی
ژمێریاری گشتی
ژمارە ١١٨٤
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
جەنابی ئەفەندم
لەسەر تەریقەتی نەقشیە حاجی ئەسعەد ئەفەندی لە شارۆچکەی کۆی سانجەق نیشتەجێیە، لە بارەی دابینکردنی برێکی گونجاو مووچە تا خواردنی خانەقایەکەی پێ بکرێت، لە ویلایەتی موسڵ بە دووپاتکردنەوە هاوپێچ نووسراوەکانی نێردراو جێبەجێ بکرێت، نووسراوی ٢٥ کانوونی یەکەم ١٣٠٩ ژمارە ١٠٤٩ نێردراوەتە ژمێریاری گشتی دارایی، بەهۆی فەرمانی پاشا لە برینەوەی مووچەی دەستکورتان و ناوە ناوە ئەنجامدانی جێبەجێ کردنەکە، پارە بەش ناکات، بۆیە دابینکردنی مووچەی بێ بەرامبەر بە فەرمانی پاشا قەدەغەکراوە، لە بارەی دابینکردنی مووچە، لە خەزینە گوێ لە هیچ ناگرن، ئەو کاغەزانەی کە هاتوون نەیانپاراستووە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ١٤ شەعبان ١٣١١ و لە ٨ شوبات ١٣٠٩
نازری دارایی

DH.ŞFR.00209.00076.001

| DH.ŞFR. | 00209.00076 | 25 زيلحيجه1314 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لە ١٤ مایس ١٣١٣ لە مەرکەزی کۆی سانجەق حەوێز زادە رەشید و هاوەڵانی ئەو تەلەگرافنامەی رایانکێشاوە دانەیەکی بردراوە و خوێندنەوەی بۆ کراوە، لە شارۆچکەی کۆی سانجەق بە گوێرەی هەواڵی ئەو جموجۆڵ و بارودۆخانەی کە هاتووە، بۆ ئامادەکاری کردن لە ١٤ مایس ١٣١٣ تەلەگرافنامەی بەندەمان بە پوختەیی راگەیەندراوە و دانیشتوانی خۆچێی بوونەتە دوو بەش، بەشێکی لەگەڵ قائیمقامن، بەشەکەی تریشی لەگەڵی نین، هەروەها سەبارەت بە جموجۆڵی باسکراودا بەهۆی خراپی کارگێری ناوبراوان تا رادەیەك کاریگەری بەسەر بارودۆخەکەدا هەبووە، بۆیە نیشان دراوە کە دەبێ بگۆردرێت و دەست بەسەر بکرێت، ئەو دانەیەی کە خوێندنەوەی بۆ کراوە، ئەوانەی تەلەگرافنامەکەیان ناردووە دەرکەوتووە دژی قائیمقامن، بە گوێرەی بەرژەوەندی دەست بەسەر بکرێن، بۆ ئێستا فەرمان.
والی موسڵ زوهدی
١٥ مایس ١٣١٣




| DH.ŞFR. | 00209.00119 | 23 شەوال 1314 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

لە ١٤ و ١٥ مارت ١٣١٣ تەلەگرافنامەی بەندەمان راگەیەندرا، لە شارۆچکەی کۆی سانجەق ئەو رووداوەی کە تێدا روویدا، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بەڕێوەبردنی خراپی قائیمقامی قەزا عەبدولرەحمان بەگ، لەگەڵ ئەمەش لەسەر ئەو ئامادەکاریانەی کە کراوە، دوکانەکان کراوەتەوە و هەر کەس سەرقاڵی کاری خۆیەتی و دەستی بە کاری خۆی کردووە، قائیمقامی ناوهاتوو گوێرایەڵی ئەو ئامۆژگاریە دووبارەکراوانە نابێت کە بەردەوام پێی دەدرێت، فەرمانبەری لێکۆڵینەوە نێردراوەتە شوێنەکە و مەترسی بابەتەکەی روون کردۆتەوە، جێگای مەترسیە دووبارە رەوان بکرێتەوە، گەندەڵی لە بەردەوام بوون دایە، هەرچی زووە بە موتەسەرفی کەرکووك راگەیەندراوە کە بەپەلە ناوبراو دووربخرێتەوە و کەسێکی تر بکرێتە قائیمقامی کۆی سانجەق، بۆ ئەمەش هەر ئێستا قائیمقامی سەلاحیە ئەمین ئەفەندی بگوازرێتەوە قەزای کۆی سانجەق و لە قائیمقامیەت دامەزرێت، هەروەها بە پەلە بچێتە شوێنەکە و ئاسایشی قەزای کۆی سانجەق جێگیر بکات و ئەو ئاژاوەیە کۆتایی پێ بهێنرێت و ئەوانەی هۆکاری ئەو رووداوەن و کە ناوەکانیان دیارە وەکو بکوژانی ............... دەستگیر بکرێن و رەوانەی مەرکەزی لیوا بکرێن، بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارانەش ئاگاداری دراوەتە خۆچێی، بۆ قەزای سەلاحیەش کەسێکی ئاوێتە بە هۆزگەرایەتی و کەسێکی گونجاو دابمەزرێت.




BEO.000800.059932.002

| BEO. | 000800.059932 | 9 موحەررەم 1314 |
|---|---|---|
| | | |

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
ژمارە ١٣٨٦
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی سەروو
راگەیەندراوی بەندەیە
لـە نـاو ویلایەتـی موسـڵ، لـە قـەزای کـۆی سـانجەق خانەیەکـی دوو دەرگایـی دەکرێتـە فەرمانگـەی حکوومـەت، لـە بەرامبـەر کرێیەکـەی لـە سـاڵی ٣١٢ دەخرێتـە نـاو موازەنـەوە، بـە فەرمانـی شـورای دەوڵـەت، فەرمانگـەی ناوەخـۆ لـە ٢٩ زیلقەعـدە ١٣١٣ نـووسراو لـە سـەدارەتپەناهی هاتـووە مانگانـە ٥٠ و ٣٥ قـوروش بـە کۆکردنـەوەی دەکاتـە ٨٥ قـوروش لـە موازەنـەی سـاڵی ٣١٢ بـە ئاقچـە تۆمـار دەکرێـت، بـە تێپەربوونـی کات ئـەو برەیـەی کـە لـە سـاڵی ناوهاتـوودا هەیـە بـە ١٠٢٠ بـە موازەنـە و ڕێکخسـتن زیـادەی دێتـە سـەر و تۆمارکردنـی لـە موازەنـەی سـاڵی ٣١٣ لـە جێبەجـێ کردنـی مامەڵەکـە ئـەوا بـە فەرمـان و نـووسراوی نەزارەتـی دارایـی جەلیلـە دەبێـت و بـە ووتـەی ژمێریـاری رادەگەیەندرێـت و بڵاودەکرێتـەوە، لـەم بارەیـەوە ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ٩ موحـەررەم ١٣١٤ و لـە ٩ حوزەیـران ١٣١٢.
نازری کاروباری ناوەخۆ


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1003 75208

| BEO. | 001003.075208 | 9 ڕەبیعی کۆتایی 1315 |
|---|---|---|

٩ ڕەبیعی کۆتایی ١٣١٥
٢٦ ئۆغستۆس ١٣١٣
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە، نووسراو
لە ناو ویلایەتی موسڵ، قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق عەبدولرەحمان بەگ دوورخراوەتەوە، لە شوێن ئەو قائیمقامی سەڵاحیە ئەمین ئەفەندی لە شوێن ئەویش قائیمقامی پێشووی شامیە مەجید بەگ دامەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە نووسراوی مێژووی ١٨ سەفەر ١٣١٥ ژمارە ١٦٨٥ی دەوڵەت و ڕەزامەندی قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە دوای مۆڵەت فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی لە ٤ ڕەبیعی کۆتایی ١٣١٥ فەرموویەتی، هەروەها هۆکاری سەرهەڵدانی کاروکردەوەی نەشیاو لە قەزای کۆی سانجەق دەگەڕێتەوە بۆ عەبدولرەحمان بەگ کە لە لایەنی کارگێرییەوە بەڕێوەبردنی کارەکانی کەموکوری هەبووە، لە دووبارە بوونەوەی ئاگاداری و ئامۆژگاریش گوێڕایەڵ نەبووە، دیسان دانیشتوان ڕووبەڕووی گەندەڵیەکی تر بونەتەوە، بە تێڕوانین لەم ئاماژانە بۆ ئەوەی بە گوێرەی نەریت لێکۆڵینەوەی سەرەتایی ئەنجام بدرێت، لە نووسراوەکانی قۆمیسیۆن ئەو ئاگادارییانە بینراوە کە دراوەتە ویلایەت، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.


BEO.001255.094122.008

| 27 شەعبان 1316 | 001255.094122 | BEO. |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
قۆمیسیۆنیفەرمانبەرانیمولکیە
ژمارە ٣٦١
نـووسراوی نەزارەتـی ناوەخـۆی جەلیلـە خوێندراوەتـەوە کـە لـە مێـژووی ٦ کانوونـی یەکـەم ١٣١٤ ژمـارە ٤٠٠٤ حەواڵـەی قۆمیسـیۆنی فەرمانبەرانـی مولکیـە کـرا.
لـە ویلایەتـی موسـڵ دوای مردنـی قائیمقامـی قـەزای کـۆی سـانجەق محەمـەد ئەمیـن ئەفەنـدی، لـە خانەدانـی روانـدز سـەعید بـەگ جگـە لـەوەی لێهاتـووە لەگـەڵ خـوی هۆزگەرێتـی هاوتایـە، بۆیـە لـە بریارنامـە و تەلەگرافنامـە لـە ئەنجوومەنـی کارگێـری ویلایـەت ئامـاژەی پێکـراوە و هاتـووە لـە قـەزای ناوهاتـوو دابمەزرێـت، ئەگەرچـی سـەعید بـەگ هەڵبژێـردراو نییـە، بـەڵام کـەس نییـە ئـارەزووی هەبێـت لـە قـەزای ناوهاتـوو بـە هەڵبژێـردراوی چینـی سـێیەم خـۆی هەڵبژێرێـت، هەرچـی ناوبـراوە ئـەوا لێهاتوویـی و توانـای پەسـەندکراوە، بۆیـە رەزامەنـدی دراوە لەسـەر دامەزراندنـی لـە قائیمقامیەتـی قـەزای ناوهاتـوو.
سـەعید بـەگ لـە هەڵبژێـردراوەکان نییـە، سـەبارەت بـە یاسـای دامەزراندنـی ئـەو جـۆرە کەسـانە لـە قائیمقامیـەت، دژی بریـاری نیزامیـە، بـۆ ئـەوەی کەسـێکی گونجاوتـر لـە قائیمقامیەتـی قـەزای ناوهاتـوو دابمەزرێـت ئـەوا نـووسراو حەواڵـەی نەزارەتـی ناوهاتـوو کـراوە، نـووسراوی ناوهاتـوو بـە هاوپێچـەوە نێردراوەتـەوە و پێشـکەش کـراوە، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
٢٧ شەعبان ١٣١٦ و لە ٢٩ کانوونی یەکەم ١٣١٤
ئەندام/ سەرۆکی قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە




| 25 شەوال 1316 | 001277.095762 | BEO. |
|---|---|---|

بابی عالی
قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە
ژمارە ٣٩٨

لە ویلایەتی موسڵ قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق محەمەد ئەمین ئەفەندی بەهۆی مردنیەوە لە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلەوە سەعید بەگ لە خانەدانەکانی رواندز هەڵبژێردراوە تا بچێتە شوێنەکەی، بەڵام ناوبراو لە هەڵبژێردراوەکان نییە، بۆ نموونەی ئەو جۆرە کەسانە بە دامەزراندنیان وەکو قائیمقام پێچەوانەی بریاری نیزامن، لە بریارنامەی ٢٩ کانوونی یەکەم ١٣١٤ راگەیەندراوە و بڵاوبۆتەوە کە کەسێکی هەڵبژێردراوی گونجاو بۆ قائیمقامیەتی ناوهاتوو هەڵبژێردرێت. ئەمجارە لە نەزارەتی ئاماژەپێکراودا بە پێشکەش کردن حەواڵە کراوە، نووسراوی ١٨ شوبات ١٣١٤ ژمارە ٤٨٦٤ بۆ قائیمقامیەتی قەزای ناوهاتوو لە چینی سێیەم نائیبی پێشووی سەلاحیە محەمەد سەعید ئەفەندی کە زمانی عەرەبی دەزانێت، لە مولازمە هەڵبژێردراوەکانیشە دامەزراندنی نیشان دراوە.
ئەگەرچی ناوبراو هەڵبژاردننامەی قائیمقامیەتی وەرگرتووە، بەڵام تا ئێستا لە قائیمقامیەت خزمەتی نەکردووە، لە کاتی ووردبینی دەرکەوتووە ناوبراو لە دادگا و سەرۆکایەتی سزا کاروکردەوەی خراپی نیشان دراوە، بەم هۆیەشەوە سێ جار دراوەتە دادگا، بۆیە کەسێکی تری گونجاو بۆ قائیمقامیەتی قەزای کۆی سانجەق هەڵبژێردرێت بۆ ئەم مەبەستەش نووسراو بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە حەواڵە کراوە، نووسراوی ناوهاتوو لەگەڵ هاوپێچەکانی گەرێندراوەتەوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتە ئەمر و فەرمان بۆ ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٥ شەوال ١٣١٦ و لە ٢٣ شوبات ١٣١٤.
ئەندام/ سەرۆکی قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی



| 8 زیلقەعدە 1316 | 001283.096203 | BEO. |
|---|---|---|

٨ زیلقەعدە ١٣١٦
٨ مارت ١٣١٥
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
بەکر بەگ یەکێکە لە سەرۆکەکانی هۆزی خۆشناو، لە گوندی بالیسانی سەر بە کۆی سانجەق نیشتەجێیە، پێش دوو سێ ساڵ لەو کاتەی لە ویلایەتی موسڵ کێشە و گرفتی دروست کردووە، بۆ ئێران هەڵاتووە، بۆیە بەکر بەگ رایگەیاندووە کە هیچ جموجۆڵێکی پێچەوانەی رەزامەندی عالی ئەنجام نادات، بە دەرکردنی لێبووردنی عالی دەگەڕێتەوە مەملەکەتی خۆی و داوای کردووە هاوکاری بکرێت، دواتریش ووتوویەتی دڵسۆز و ملکەچ دەبێت، بۆ ئەم مەبەستە نووسراو لە شەهبەندەری ساوچبۆلاغ بۆ نەزارەتی دەرەوەی جەلیلە نێردراوە، وێنەیەکی نەزارەتی ناوهاتوو لەگەڵ نووسراوی ٦ زیلقەعدە ١٣١٦ ژمارە ٥٦ بەیەکەوە بۆ دەوڵەت نێردراوە، بە گفتوگۆ لەگەڵ ویلایەت بە ئاماژەی دەوڵەت هیممەت بکرێت لە ناردنەوەی هاوپێچەکان، بۆ ئەم مەبەستەش نوسراو کراوە.


٣٧٤٦

i.DH. 1364/1317.M/32

İ.DH.01364

| I.DH. | 01364.000032 | 28 زيلحيجه 1316 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
٣٧٤٦
بۆ جەنابی ئەفەندیم
قائیمقامیەتەکەی قەزای کۆی سانجەق سەر بە ویلایەتی موسڵ بە کراوەیی ماوەتەوە، سەبارەت بە دامەزراندنی نائیبی پێشووی قەزای سەڵاحیە محەمەد سەعید ئەفەندی، نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە و بریارنامەی قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە و کاغەزی وەرگێردراوی ناسنامە بەیەکەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بارەیەوە فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی و سەدارەت بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، نووسراو نووسراوەتەوە ئەفەندم، لە ٢٨ زیلحیجە ١٣١٦ و لە ٢٧ نیسان ١٣١٥.
سەدری ئەعزەم



DH.MKT.02105.00114.001

| 26 ڕەبیعی کۆتایی 1316 | 02105.00114 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٦ ڕەبیعی کۆتایی ١٣١٦
١ ئەیلوول ١٣١٤
بۆ نەزارەتی سندوقی خانەنشینی مولکیەی جەلیلە
لــە بــارەی بریــنــەوەی مووچــە بــۆ خانــەوادەی قائیمقامــی خوالێخۆشــبووی کــۆی ســانجەق محەمــەد ئەمیــن ئەفەنــدی، خانەوادەکــەی داوایــان کــردووە مووچەیــان بــۆ ببڕێتــەوە، بــە گوێــرەی ئــەو داواکاریــەی کــە دراوە لــە ڕووی فەرمانبەرێتیــەوە خشــتەی مــاوەی خزمــەت و کاغــەزە جیاجیاکانــی بەیەکــەوە بــۆ ســەروو نێردراوە، بــە تێروانیــن لــە بابەتەکــە بــا ســەروو بفەرمووێــت تــا هیممــەت بکرێــت لــە جێبەجــێ کردنــی.



DH.MKT.02149.00133.001

| 1316 شەعبان 4 | 02149.00133 | DH.MKT. |
| --- | --- | --- |

٤ شەعبان ١٣١٦
٦ کانوونی یەکەم ١٣١٤
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
لە ویلایەتی موسڵ بەهۆی مردنی محەمەد ئەمین ئەفەندی قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق، خانەدانی رواندز سەعید بەگ لەبەر لێهاتوویی و توانای ناوبراو، جگە لەمەش لەگەڵ دابونەریتی هۆزایەتی ئاوێتە دەبێت، لە قائیمقامیەتی قەزای ناوهاتوو دامەزرێت، لەم بارەیەوە لە ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەت لەگەڵ پایەی ویلایەت بریارنامە و تەلەگرافنامە هاتووە و ئاماژەی پێکراوە ئەگەرچی لە قەزای کۆی سانجەق لە چینی سێیەم سەعید بەگ هەڵبژێردراو نییە، بەڵام لە چینی باسکراودا کەسێك نییە هەڵبژێردراو بێت، بۆیە ناوبراو هەڵبژێردرێت و لە قەزای ناوهاتوو دامەزرێت، بۆ ئەمەش لیستی ..... ماددەی سێیەم چەسپێنراوە، بریارنامەی ناوهاتوو و تەلەگرافنامەکان هاوپێچ پێشکەش کراوە، جێبەجێ کردنی لەسەر جەنابی سەدارەتپەناهی وەستاوە.




DH.MKT.02155.00116.001

<table dir="rtl">
<tr><td>DH.MKT.</td><td>02155.00116</td><td>20 شەعبان 1316</td></tr>
<tr><td colspan="3">٢٠ شەعبان ١٣١٦<br>٢٢ کانوونی یەکەم ١٣١٤<br>بۆ نەزارەتی تەلەگراف و پۆستەی عالی<br>بۆ مەرکەزی تەلەگرافی کۆی سانجەق سندوقی کەلوپەلی تەلەگراف نێردراوە، بەڵام لە نێوان دوزخورماتو ............ لەلایەن محەمەد بەگ خەڵکی داودە دەستی بەسەرداگیراوە، بە نووسراوی عالی لە مێژووی ٥ کانوونی یەکەم ١٣١٤ ژمارە ٤٨٥ بۆ چارەسەری وەرگرتنەوەی کەلوپەلی ناوهاتوو نووسراو بۆ موسڵ نووسراوەتەوە، لە وەڵامدا تەلەگرافنامە لە مێژووی ١٦ کانوونی یەکەم ١٣١٤ دەرچووە تێدا هاتووە یەك سندوق کەلوپەلی تەلەگرافی ناوهاتوو بە ئاژەڵی بارهەڵگر بەیەکەوە گەڕێندراوەتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش نووسراو کراوە.</td></tr>
</table>



| 19 شەوال 1316 | 02172.00099 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٩ شەوال ١٣١٦
١٨ شوبات ١٣١٤
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی

قائیمقامیەتی قەزای کۆی سانجەق بە بەتاڵی ماوەتەوە، راگەیەندراوە و ئاماژەی پێکراوە کە خەڵکی رواندز سەعید بەگ دامەزرێت، بەڵام دەرکەوتووە کە لە هەڵبژێردراوەکان نییە، لە وەڵامدا هاتووە کە کەسێکی هەڵبژێردراو و گونجاو بۆ قائیمقامیەتی قەزای ناوهاتوو دابنرێت، لە نووسراوی سەدری ئەعزەم لە مێژووی ٢ کانوونی دووەم ١٣١٤ ژمارە ٣٥٧٧ فەرمان دراوە کە نائیبی پێشووی سەڵاحیە محەمەد سەعید ئەفەندی لە چینی سێیەم لە مولازمە هەڵبژێردراوەکانە و زمانی عەرەبی باشە بۆ قائیمقامیەتی قەزای ناوهاتوو دامەزرێت، پشت بەستن بە ماددەی سێیەمی لیستی چاکسازی بە چەسپاندن کاغەزی وەرگێردراوی زانیاری کەسێتی هاوپێچ پێشکەش کراوە، جێبەجێ کردنی رای وەکالەتپەناهیە.




| DH.MKT. | 02183.00124 | 18 زیلقەعدە 1316 |
|---|---|---|

١٨ زیلقەعدە ١٣١٦
١٨ مارت ١٣١٥
بۆ ویلایەتی موسڵی عالی
بەکر بەگ یەکێکە لە سەرۆکەکانی هۆزی خۆشناو و دانیشتووی گوندی بالیسانی کۆی سانجەق، پێش دوو سێ ساڵ لە ویلایەتی عالی کێشە و گرفتی دروست کردووە و رایکردووە بۆ ئێران، ناوبراو رایگەیاندووە هیچ چالاکیەك ئەنجام نادات و رەزامەندی عالی بەدەست دەهێنێت، داوای کردووە لێی خۆش بن تا بگەرێتەوە مەملەکەتی خۆی، دواتر لە شەهبەندەری ساوجبۆلاق باسی کردووە کە دڵسۆزی دەنوێنێت و ملکەچ دەبێت، لە ئاماژەی نەزارەتی دەرەوەی جەلیلە لە مێژووی ٩ مارت ١٣١٥ ژمارە ٩٠ لە نووسراوی سەدری ئەعزەم ئاماژەی پێکراوە، بە تێروانین لە وێنەی داواکاریەکە و زانیاری خۆچێی لە سەرەوە خوێندنەوەی بۆ دەکرێت و رادەگەیەندرێت.


T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
2185 14

DH.MKT.02185.00014.001

| DH.MKT. | 02185.00014 | 22 زیلقەعدە 1316 |
|---|---|---|

بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
٢٢ زیلقەعدە ١٣١٦
٢٢ مارت ١٣١٥

سەبارەت بە دامەزراندنی نائیبی پێشووی سەڵاحیە محەمەد سەعید ئەفەندی لە قائیمقامی قەزای کۆی سانجەقی سەر بە ویلایەتی موسڵ، لە وەڵامدا نووسراوی سەدارەتپەناهی لە مێژووی ٢٥ شوبات ١٣١٤ ژمارە ٤٠٦٢ هاتووە، ئەگەرچی ناوبراو هەڵبژاردننامەی وەرگرتووە، بەڵام تا ئێستا ئەرکی قائیمقامیەتی وەرنەگرتووە، هەروەها لە سەرۆکایەتی سزا و دادگا سێ چوار جار دراوەتە دادگا، ئەمەش لە کارتی زانیاریدا دەرکەوتووە، ئەگەرچی داواکراوە بۆ قەزای ناوهاتوو کەسێکی گونجاو تر دابمەزرێت، بەڵام دوای ووردبینی و بەدواداچوون دەرکەوتووە محەمەد سەعید ئەفەندی نەدراوەتە دادگا و هیچ تۆمارێك نییە نیشان بدات کە ناوبراو سێ جار درابێتە دادگا، بەڵکو ئەرکی لە سەرۆکایەتی سزا و دادگادا پێ سپێردراوە، جگە لەمە لە سانجەقی نەجد یاریدەدەری داواکاری گشتی بووە، لەسەر ئەو سکاڵایانەی لەسەری هەبووە، دراوەتە دادگا، لە ئەنجامیش بێ تاوان دەرچووە، قەزای ناوهاتووش لە چینی سێیەمە، لە دەرچووی مەکتەبی شاهانە یاخود لە هەڵبژێردراوەکان کەسێك نییە ئارەزووی ئەو کارە بکات، ماوەی ساڵێکیشە بە وەکالەت بەڕێوەدەبردرێت، بۆیە بە پێویست دەزانرێت ناوبراو لە قائیمقامیەتی ناوهاتوو دابمەزرێت بۆ ئەمەش پەلە لە راگەیاندن و دووپاتکردنەوەی کراوە، کاغەزی وەرگێردراوی زانیاری کەسێتیشی هاوپێچ پێشکەش کراوە، جێبەجێ کردنی بۆ وەکالەتپەناهیە.




DH.MKT.02190.00085.001

| 5 زیلحیجە 1316 | 02190.00085 | **DH.MKT.** |
|---|---|---|

٥ زیلحیجە ١٣١٦
٤ نیسان ١٣١٥
بۆ ویلایەتی موسڵی عالی
بەکر بەگ لە سەرۆکەکانی هۆزی خۆشناوە و لە گوندی بالیسانی کۆی سانجەق نیشتەجێیە، پێش دوو سێ ساڵ لە ویلایەتی عالیەوە کێشە و گرفتی دروست کردووە، لەم کاتەوە بۆ ئێران رایکردووە، ناوبراو بە داواکاریەك رایگەیاندووە کە هیچ جموجۆڵێکی پێچەوانەی دەوڵەت ئەنجام نادات و داوای کردووە لێبووردنی گشتی بۆ دەربکەن و رێگە بدەن بگەڕێتەوە مەملەکەتی خۆی، دواتریش بە شەهبەندەری ساوچبوڵاقی راگەیاندووە کە دڵسۆز دەبێت و پابەندی ملکەچ بوون دەبێت، لەسەر ئاماژەی نەزارەتی دەرەوەی جەلیلە نووسراوی سەدری ئەعزەم لە ١٨ مارت ١٣١٥ نووسراوەتەوە، سەبارەت بە ناوبراوەوە کە لە ئێران نیشتەجێ بووە، لەلایەن حکوومەتی ئێرانەوە پێشنیار کراوە و لە جەنابی خەلافەتپەناهی پاراوەتەوە و رایگەیاندووە کە لە ماوەیەکی نزیکدا دەگەڕێتەوە، لە بارەی دووپاتکردنی چۆنیەتی جێبەجێ کردنی کارەکە ئەمجارە لە شەهبەندەری ناوهاتووەوە نووسراو بۆ نەزارەتی ناوهاتوو هاتووە و حەواڵەی سەدارەتپەناهی کراوە، وێنەی تەلەگرافنامەکە هاوپێچ بۆ عالی نێردراوە بە تێروانین لە ئاماژەی پێشوو بەپەلە خوێندنەوەی بۆ بکرێت و رابگەیەندرێت.




| DH.TMIK.M. | 00120.00024 | 22 شوبات 1317 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
چەتەكانی شێخ بزێنی تا گەیشتوونەتە گوندەكانی دەوروبەری شارۆچكەی هەولێر و كۆی سانجەق، كاروانەكانیان تاڵان كردووە، ئەو پۆلیسانەی پاراستن كە دەنێردرێن، وەكو هێزی پاڵپشت ١٠٠ تا ٨٠ سەربازیان لەگەڵ بنێردرێت، لە موتەسەرفیەتی كەركووك ئاماژەی پێكراوە، لە قائیمقامەكانی كۆی سانجەق و هەولێر لەگەڵ فەرمانبەرانی پۆلیسی پاراستن داوای نووسراو و زانیاری كراوە، بە ناردنی پیاوی تایبەت لێكۆڵینەوە كراوە، لە هەمەوەندەكان عەبدولكەریم و لە هۆزی شێخ بزێنی ئەسعەد و برادەری بە ناوی تۆفیق ١٢ ئێستر بردراوە، بەڵام بە گەڕانەوەیان دراوەتەوە خاوەنەكانیان بەم شێوەیە دەركەوتووە بە پێویست نازانرێت مەفرەزەیەكی ١٠٠ كەسی بنێردرێت، لە ٢٢ شوبات ١٣١٧.
رەشید والی موسڵ




| | | |
|---|---|---|
| BEO. | 001316.098632 | 17 موحەررەم 1317 |

١٧ موحەررەم ١٣١٧
١٦ مایس ١٣١٥
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

لە بارەی دامەزراندنی نائیبی پێشووی قەزای سەڵاحیە محەمەد سەعید ئەفەندی لە قائیمقامیەتی قەزای کۆی سانجەق، لەسەر نووسراوی دەوڵەت لە مێژووی ٢٢ زیلقەعدە ١٣١٦ ژمارە ٢٩٠ و بە بڕیاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە بە ڕەزامەندی ١٤ موحەررەم ١٣١٦ فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرموویەتی، ناوبراو پێشووتر لە دادگای سەرەتایی شارەزوور سەر بە سەرۆکایەتی سزا، لە دادگای داواکاری گشتی دادگایی کراوە، لە دەستەی تاوانیش بڕیاردراوە کە دادگاییەکەی قەدەغە بکرێت، لە قائیمقامیەتیش سکاڵای لەسەر تۆمار کراوە، بەڵام بەکارهێنانی قەدەغەکراوە، ئەمەش لە قۆمیسیۆنی ناوهاتوو لە نووسراوەکاندا دەرکەوتووە، بۆ ئەمەش نووسراو کراوە تا هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی کارەکە.




DH.MKT.02210.00008.001

| DH.MKT. | 02210.00008 | 3 سەفەر 1317 |
| --- | --- | --- |

٣ سەفەر ١٣١٧
٣١ مایس ١٣١٥
بۆ ویلایەتی موسڵی عالیە
بە تەلەگراف دامەزراندنی نائیبی پێشووی قەزای سەڵاحیە محەمەد سەعید ئەفەندی لە قائیمقامیەتی قەزای کۆی سانجەق دەرچووە، پێشەکی فەرمانی پاشای جەنابی پاشا فەرموویەتی کە لە دادگای سەرەتای شارەزووری سەر بە سەرۆکایەتی سزا، لەسەر داواکاری گشتی دادگای سەرەتایی دراوەتە دادگا، بەڵام بریاری قەدەغەکردنی لە دەستەی تاوان دەرچووە، پشت بەستن بەم بریارە بەهۆی ئەو سکاڵایانەی کە لەسەری هەیە ناکرێت ببێتە قائیمقام، نووسراوی سەدری ئەعزەم لە ١٧ مایس ١٣٠٥ ژمارە ٨٣٥ نووسراوەتەوە کە ناوبراو بۆ حیجاز رۆیشتووە تا ئەرکی حەج جێبەجێ بکات، هەواڵ هاتووە کە لەوێ راستەوخۆ دەچێتە سەر کارەکەی، بۆیە لە گەرانەوەی بریارەکەی پێ رابگەیەندرێت.




| 4 جەمادی یەکەم 1317 | 02244.00089 | DH.MKT. |
| --- | --- | --- |

٤ جەمادی یەکەم ١٣١٧
٢٨ ئۆغستۆس ١٣١٥
بۆ ویلایەتی موسڵی عالیە
لە ناو قەزای کۆی سانجەق ئەو زەوییە کشتوکاڵیەی بە ناوی چەکل بەڕێوە دەبات، بەشێکی لەلایەن بینباشی چوارەم عەزیز ئەفەندی لە ئالای ٤٦ی نیزامیەی سلێمانیە دەستی بەسەر داگیراوە، ناوبراو خستویەتیە سەر خانەکەی، ئەوەی خستویەتیە سەر خانەکەی هی ئالای کاتیبی جارولڵا ئەفەندی لە فرقەی حیجازی سەربازیە، داواکاری نێردراوە، وێنەی داواکاریەکەی لەگەڵ تێروانین لەو زانیاریانەی کە لەوێ هەیە بەپەلە جێبەجێ بکرێت، ئەنجامەکەی هەروەها زانیاری لەسەر ئەنجامەکەشی بنێردرێت، لەم بارەیەوە عالی بفەرمووێت.



DH.MKT.02249.00019.001

| 15 جەمادی یەکەم 1317 | 02249.00019 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٥ جەمادی یەکەم ١٣١٧
٨ ئەیلوول ١٣١٥
بۆ ویلایەتی موسڵی عالیه
محەمەد سەعید ئەفەندی لە قائیمقامیەتی قەزای کۆی سانجەق دامەزراوە، بە نووسراوی ٣١ مایس ١٣١٥ دیاریکراوە کە لە حیجازەوە راستەوخۆ دەچێتە شوێنی ئەرکەکەی، بەڵام ئەو هاتۆتە دەرسەعادەت، ناوبراو هەر کە گەیشتە شوێنی کارەکەی و لە مێژووی دەست بەکار بوونیەوە مانگانە ١١٢٥ قوروش مووچەی بۆ دەبردرێتەوە، بە گوێرەی بریاری نیزام جێبەجێ دەکرێت، جگە لە ٦٪ی خەرجی رێگا کە پێویستە پێی بدرێت، لە ١٧٩٩ قوروش لە ٥٪ی دەنێردرێتە سندوق، لە ویلایەتی عالی لە موازەنەی ناوەخۆی ئەم ساڵە خەرجی رێگای بۆ رێکخراوە و خەرج کردنی لە خشتەی خەرجی تۆمار کراوە و بە ووتەی ژمێریاری راگەیەندراوە و جێبەجێ دەکرێت.




DH.MKT.02272.00021.001

| 13 رەجەب 1317 | 02272.00021 | DH.MKT. |
|---|---|---|
| ١٣ رەجەب ١٣١٧<br>٤ تشرینی دووەم ١٣١٥<br>بۆ ویلایەتی موسڵی عالیە<br>عەلی رزا ئەفەندی باوکی بۆلولو مردووە، لە مووچەی قائیمقامی کۆی سانجەق سێ مانگ و نیو مووچەی کەڵەکەبووی هەیە، بۆلولو عەلی رزا ئەفەندی داوای کردووە مووچەکەی بۆ بنێردرێت، بە مۆری بۆلولو عەلی رزا قوتابی لە پۆلی دووەمی مەکتەبی هونەری شاهانە، داواکاری دراوە، بۆ دەوڵەت نێردراوە، دواى لێکۆڵینەوە جێبەجێ دەکرێت، لەم بارەیەوە کار بکرێت. | | |



DH.MKT.02274.00077.001

| 19 رەجەب 1317 | 02274.00077 | DH.MKT. |
| --- | --- | --- |

١٩ رەجەب ١٣١٧
١٠ تشرینی دووەم ١٣١٥
بۆ ویلایەتی موسڵی عالی
لەسەر فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی پاشکۆی کشتوکاڵ و راست کردنەوەی کەم کردنەوە لەگەڵ تۆمارەکانی ئەنجام دراوە، کەچی قائیمقامی قەزاکە بە پێچەوانەی خەلافەت جولەی کردووە و خزم و کەسی کردۆتە فەرمانبەری داهات، بە واژووی تەحسیلداری قەزای کۆی سانجەق ئەمین، تەلەگرافنامە هاتووە و نێردراوە، هەروەها قەدەغەکردن و وەرگرتنی وێنەکەی سەرەتا بە بڵاوکردنەوە جێبەجێ کراوە و بە تێروانین لە ئاگاداریەکان بە لێکۆڵینەوە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

DH.SN.THR.00010.00016.001

| DH.SN.THR. | 00010.00016 | 28 رەبیعی یەکەم 1318 |
| --- | --- | --- |
| بەڕێوەبەرایەتی کارگێری گشتی ناسنامەی عالی دەرسەعادەت<br>بۆ قەزاکانی کەرکووك و هەولێر و کۆی سانجەق بە ژمارە ١٥٣ تۆماری عوسمانی نوێ خەرج کراوە، لە بەر ئەوەی لە مەرکەز داوانەکراوە و ڕەزامەندی نەدراوە، ئەوا لە کارگێری ناسنامەی دەرسەعادەت پرسیار بکرێت ئایا ئەوانەی بوونەتە هۆکاری ئەم خەرج کردنە بە خۆڕاییە، بخرێنە یاخود نەخرێنە ژێر دڵنیاییەوە، لە ١٣ تەمموز ١٣١٦.<br>محەمەد بەڕێوەبەری ناسنامە | | |




İ.AS.00034.00005.001

| I.AS. | 00034.00005 | 11 جەمادی کۆتایی 1318 |
|---|---|---|

کۆشکی یڵدزی هومایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
٤٥٤١
ڕاگەیەندراوی بەندەیە

لــە ڕەدیفــی ٩٠ی لەشــکری شەشــەمی هومایــۆن، قائیمقــام محەمــەد عــارف بــەگ خەریکــە لــە لەشــکری پێنجەمــی هومایــۆن دەســت بــە کار دەبێــت، بۆیــە یــەك نمــرە پلەکــەی بــەرز دەکرێتــەوە، جێبەجــێ کردنــی بــە فەرمانــی پاشــای جەنابــی خەلافەتپەناهــی عالــی دەبێــت، ئەمــر و فەرمــان بــۆ جەنابــی ئــەو کەســەیە کــە فەرمــان دەردەکات، لــە ١١ جەمــادی کۆتایــی ١٣١٨ لــە ٢٣ ئەیلــوول ١٣١٦.
جەنابی شەهریاری .....




| BEO. | 001495.112068 | 2 سەفەر 1318 |
|---|---|---|

٢ سەفەر ١٣١٨
١٨ مایس ١٣١٦
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
ئەو بابەتانەی کە دراوەتە پاڵ قائیمقامی پێشووی قەزای کۆی سانجەق عەبدولرەحمان بەگ، لە ویلایەتی موسڵ لێکۆڵینەوەی سەرەتایی ئەنجام دراوە و لە مێژووی ١٩ زیلقەعدە ١٣١٥ ژمارە ٣٦٦ حەواڵەی شورای دەوڵەت کراوە، لەسەر ئەم نووسراوە دوای گفتوگۆ لەگەڵ ویلایەتی موسڵ بریارنامە دراوەتە فەرمانگەی مولکیە، بە تێروانین لە کاغەزەکانی ناوهاتووی ئەم بابەتە هیچ هۆکارێك نییە کە رێگر بێت لە کارکردنەوەی و پێویست بە دادگاییکردن و تۆمەتبار کردنی ناکات، بەڵام هەندێك کەس دژی قائیمقامن، هێرشیان کردۆتە سەر قۆناغی حکوومەت و بۆ ماوەی پێنج رۆژ بازاڕەکان داخراون، دوای پێنج تا شەش رۆژ لەم رووداوە نائیبی قەزا ئەحمەد ئەفەندی بە شەو لە خانەکەی بە فیشەکی تفەنگ کوژراوە، لەم بابەتەدا بە گوێرەی ئەو مامەڵە سەرەتاییانەی کە کراوە، لە نێوان کاغەزەکان تەلەگرافنامەکان بوونیان هەیە، لەبەر ئەوەی کوشتن و رووداوەکەی ناوهاتوو پەیوەندیان بە یەکتریەوە هەبووە، چ ئەو کاغەزانەی پەیوەستە بە تەلەگرافنامەکان و چ رووداوەکە لە لایەنی داد هەڵگیراوە، ئەو کاغەزانە و لەگەڵ کاغەزی تەلەگرافنامەکانی کوشتنی حەسەن ئەفەندی قائیمقامی مەعمورەی حەمیدیە لەلایەن پشدەریەکانەوە، هەموو کاغەزە بنەرەتیەکان لەگەڵ یەك رێك بخرێن و ئەوەی پێویستە لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی یاسایی لەبارەی ئەو کەسانە بکرێت کە هۆکاری ئەم رووداوانەن، لە کاتی دادگایی کردنیشدا ئەگەر هاتوو عەبدولرەحمان بەگ دەستی لە رووداوی ناوهاتوودا هەبوو یاخود کەموکوری هەبوو، ئەو کاتە کاری پێویست دەکرێت، نووسراو کراوە کە کاغەزەکانی لێکۆڵینەوە بۆ ویلایەتی ناوهاتوو بنێردرێت، هیممەت بکرێت لە ئەنجام دانی کارەکان.



DH.MKT.02398.00034.001

| | | |
|---|---|---|
| 19 رەبیعی کۆتایی 1318 | 02398.00034 | DH.MKT. |

٣ ئۆغستۆس ١٣١٦
بۆ ویلایەتی موسڵی عالی
٢١ حوزەیران ١٣١٦ ژمارە ٤٠ وەڵامی نووسراوی عالیە، قائیمقامی کۆی سانجەق سەعید ئەفەندی بۆ ئەوەی بێتە مەرکەزی ویلایەت داوای مۆڵەتی چوار مانگی کردووە، بۆ ئەم مەبەستە مۆڵەتەکەی جێگیر کراوە.






DH.MKT.02475.00089.001

| DH.MKT. | 02475.00089 | 2 جەمادی کۆتایی 1318 |
|---|---|---|
| ٢ جەمادی کۆتایی ١٣١٨<br>٩ نیسان ١٣١٧<br>بۆ نەزارەتی مەعاریفی جەلیلە<br>لە سایەی جەنابی پاشای مەعاریف لە شارۆچکەی کۆی سانجەق دووبارە مەکتەبی سەرەتایی بونیادنراوە، بە فەرمی کردنەوەی مەکتەبەکە ئەنجام دراوە، بەم بۆنەیەوە دووبارە لەلایەن جەنابی سێبەری خودایی نزای بۆ کراوە، تەلەگرافنامە لە ٤ نیسان ١٣١٧ لە ویلایەتی موسڵ هاتووە و هاوپێچ بۆ عالی نێردراوە. | | |



DH.TMIK.M.00110.00052.001

| DH.TMIK.M. | 00110.00052 | 14 جەمادی یەکەم 1319 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
شیفرە لە ویلایەتی موسڵ بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە نێردراوە
ساڵی رابردوو محەمەد شەریف لە گوندی مەمتەراوا خانەکەی بۆ کۆی سانجەق گواستۆتەوە، لەگەڵ ئەوەش پەیوەندی بە قادر ئاغا کردووە، ئەمجارە محەمەد شەریف و هاوەڵانی ئاگریان لە گوندی مەمتەراوا سەر بە ناحیەی مەرگە بەرداوە، لە ئەنجام ٢٥ گیان و ٨٥٠٠ قیە گەنم و ٦٥٠٠ قیە جۆ و بە بەهای ٤٥٠٠ قوروش کەلوپەلی ماڵیان سووتاندووە، لەسەر ئاماژەی قائیمقامیەتی مەعمورەی حەمیدیە لە موتەسەرفیەتی سلێمانیە ئاماژەی پێکراوە و لێکۆڵینەوە لەسەر هۆکاری سووتاندن و راگەیاندنی بکرێت و بوێری کەران بدۆزرێنەوە لە بارەیانەوە مامەڵەی یاسایی جێبەجێ بکرێت، لە وەڵامدا لە موتەسەرفیەتی ناوهاتوو رێنمایی پێویست جێبەجێ کراوە، بە گوێرەی ئەو زانیاریانەی وەردەگیرێت ئەنجامەکەی رادەگەیەندرێت، فەرمان، لە ١٦ ئۆغستۆس ١٣١٧.
نازم والی موسڵ

DH.ŞFR.00264.00014.001

| DH.ŞFR. | 00264.00014 | 14 جەمادی یەکەم 1319 |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
محەمەد شەریف و هاوەڵانی خانەکەی لە گوندی مەمتەراوا بۆ گوندی کۆی سانجەق گواستۆتەوە، لەوێش پەیوەندی بە قادر ئاغا کردووە، ئەمجارە چۆتە سەر گوندی مەمتەراوا سەر بە ناحیەی مەرگە، گوندەکەی سووتاندووە، لە ئەنجام ٢٥ خانە لەگەڵ ٨٥٠٠ قیە گەنم و ٦٥٠٠ جۆ و ٤٥٠٠ قوروش کەلوپەل سووتاوە، لەسەر ئاماژەی قائیمقامی مەعمورەی حەمیدیە لە موتەسەرفی سلێمانیە ئاماژەی پێکراوە، کە تێدا هاتووە بۆ دەست نیشان کردنی هۆکاری ئاگرەکە لێکۆڵینەوە بکرێت و رابگەیەندرێت، هەروەها بوێری کەرانیش بدۆزرێنەوە و مامەڵەی یاساییان لەگەڵ بکرێت، بۆ ئەمەش ئامۆژگاری پێویست دراوەتە موتەسەرفیەتی ناوهاتوو، بە گوێرەی ئەو زانیاریانەی کە وەردەگیرێن ئەنجامەکەی رادەگەیەندرێت، فەرمان، لە ١٦ ئۆغستۆس ١٣١٧.
نازم والی موسڵ



| 28 ڕەبیعی یەکەم 1319 | 02510.00061 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٨ ڕەبیعی یەکەم ١٣١٩
٢ تەمموز ١٣١٧
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی

مێژووی ١٨ مایس ١٣١٦ وەڵامی نووسراوی سەدری ئەعزەمە، عەبدولڕەحمان قائیمقامی پێشووی قەزای کۆی سانجەق لەسەر بابەتی هێرشکردنە سەر قۆناغی حکوومەت و تێکدانی ئاسایش و بابەتی کوشتنی نائیبی قەزای ناوهاتوو ئەحمەد ئەفەندی، دەرکەوتووە پەیوەندی بەم تاوانانەوە هەیە، هەروەها بە ڕێگەی پشدەریەکانەوە قائیمقامی مەعمورەی حەمیدیە حەسەن ئەفەندی بەکوشتن داوە، ئەو تەلەگرافنامە و کاغەزی پەیوەندیدار بەیەکتریەوە لکێندراوە تاوەکو لێکۆڵینەوەی یاسایی لە بارەیەوە بکرێت، ئەگەر بە دادگا بسەلمێنرێت کە عەبدولڕەحمان بەگ دەستی تێدا هەیە، ئەوا بە گوێرەی ئەو وەڵامەی پێشوو نێردراوە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، لە پایەی ویلایەتی موسڵ نووسراوی مێژووی ٢٧ مایس ١٣١٧ ژمارە ٢٥ لەگەڵ کاغەزی لێکۆڵینەوە بۆ جەنابی وەکالەتپەناهی نێردراوە.




DH.MKT.02544.00011.001

<table dir="rtl">
<tr><td>DH.MKT.</td><td>02544.00011</td><td>21 جەمادی کۆتایی 1319</td></tr>
<tr><td colspan="3">٢٢ ئەیلوول ١٣١٧<br>بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی<br>مامۆستای خانەی هونەری (دار فنون)ی دانیمارکی موسیو ویتەفەك لە باڵیۆزی ئێران داوەتی دراوەتە دەست، نووسراوەتەوە کە لە ڕێگەی موسڵ و حەلەب دەچێتە ئینگلتەرا، پشکنینی بۆ سنوورەکانی قەزاکانی سلێمانیە و مەعمورەی حەمیدیە و رانیە و کۆی سانجەق کردووە و تێدا سوراوەتەوە، لە مەمالیکی ئێران گەراوەتەوە ساوچبۆلاغ، لە باش مودیری بەغداد تەلەگرافنامە نێردراوە، وێنەیەکی بە هاوپێچی نووسراوی نەزارەتی پۆستە و تەلەگرافی عالی لە مێژووی ١٨ ئەیلوول ١٣١٧ ژمارە ٣٩٨ لەسەر فەرمانی سەدارەتپەناهی پێشکەش کراوە.</td></tr>
</table>



DH.MKT.02578.00087.001

| DH.MKT. | 02578.00087 | 11 شەوال 1319 |
|---|---|---|

١١ شەوال ١٣١٩
٨ کانوونی دووەم ١٣١٧
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
لە بنەرەتدا لە خەڵکی دەرسەعادەتە، بەڵام لە شوێن خۆیدا دەیەوێت ببێتە سەرباز، لەسەر هەندێك ووتە و داواکاری لەلایەن بەرێوەبەری دارایی قەزای کۆی سانجەق محەمەد جەلالەددین ئەفەندی داواکاری دراوە، لەسەر ئەم داواکاریە ئەو ئاماژە و وەڵامەی لە ویلایەتی بەهیە لە مێژووی ٧ شوبات ١٣١٣ نووسراوی هاوپێچ بۆ لایەنی واڵای سەر عەسکەر نووسراو رۆیشتووە، لەم بابەتە پێشەکی نووسراو لە لەشکری هومایۆنی موشیرەتی جەلیلە نێردراوە، لەگەڵ نووسراو و هاوپێچەکانی دانراون، ئەو لێکۆڵینەوەی لە فەرمانگەی پیادە ئەنجام دراوە و لە ئەنجامی ووردبینیەکاندا عەبدولغەنی و بەسیم و حوسێن حەفزی و ئەحمەد موختار لەگەڵ برادەرەکانی محەمەد جەلالەددین ئەفەندی، لەگەڵ ئەوەی لە گەرەکی ئوجی بەگی کەرکوك لە دەفتەری بیانی تۆمارکراون، سەربازیان کردووە، محەمەد تۆفیق ئەفەندی باوکی ناوبراوان مردووە لە بنەرەتدا لە خەڵکی دەرسەعادەتە، ماوەی ٣٠ ساڵ لەو شوێنانەی کە بوونیان هەبووە فەرمانبەر بووە، هەر لەم شوێنانەش کورەکانی لە دایك بوونە، هەرچی مردووی ناوبراوە ئەوا لەگەڵ دەرسەعادەت پەیوەندی نەبریوە، ئەو شوێنانەی کە بوونی لێی هەبووە، وەکو ئەوە وایە تێدا نیشتەجێ بووبێت، موڵك و زەوی ئەو جۆرە شتانەشی نییە، هەروەها بە شێوەی ئەرکەکەی یاخود بازرگانیەکەی ئەوانەی لە تەشرە بوونە ئەو شوێنەی کە بوونیان تێدا هەبووە، ئەو منداڵانەی لەوێ لە دایك دەبن بۆ باوکەکە رەگەزنامەی ئەو شوێنە وەردەگرێت، بۆ وەرگرتنیان لە سەربازیش بە گوێرەی یاسانامەی هومایۆن ماددەی ٣١ بە تێروانین لە جێبەجێ کردنی بریاری شورای دەوڵەت، باوکی ناوبراوان بە ناسنامەی شوێنەکە خزمەتی سەربازی بۆ هەژمار دەکرێت، هەروەها ئاگاداری دراوەتە موشیرەتی ناوهاتوو، ئەمجارە لە وەڵامدا نووسراوی سەر عەسکەر هاتووە، بە گوێرەی ئەوە هیممەت دەکرێت لە جێبەجێ کردنی.




DH.MKT.02593.00057.001

<table>
<tr><td>DH.MKT.</td><td>02593.00057</td><td>18 سەفەر 1319</td></tr>
<tr><td colspan="3">١٨ سەفەر ١٣١٩<br>١٣ شوبات ١٣١٧<br>بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە<br>لەسەر قائیمقامی پێشووی کۆی سانجەق عەبدولرەحمان بەگ لە ویلایەتی بەهیە لێکۆڵینەوە کراوە و کاغەزەکان نێردراوە، لەم بابەتە بە گفتوگۆکردن و لە پلەی والا نووسراو هاتووە، هەروەها بە تێروانین لەو ئیستدعانامەیەی کە لەلایەن ناوبراوەوە دراوە، قائیمقامی ناوبراو هیچ کارێکی بەدی نەبینراوە، بە پێچەوانەوە لە کاتی هێرش کردن پارێزگاری لە فەرمانگەکانی حکوومەت کردووە و دژی ئەوانە وەستاوە کە ئاسایشی ناوچەکەیان تێکداوە، رێگەی نەداوە جموجۆڵی گەندەڵی روو بدات، دەوڵەتی پاراستووە، لەم بارەیەوە هەوڵ و کۆششی دیارە، لەم لایەنەوە کاریگەری دەرکەوتوە، بۆیە پێویست ناکات دادگایی بکرێت، ئەو سکاڵایانەی لەسەری تۆمار کراوە راست نین و ئەسڵ و ئەساسی نییە، لەسەر ئەو بەڵگانەی کە هەیە و پشت بەستن بە زانیاریەکان عەبدولرەحمان بەگ بە شێوەی تاوانبار دادگایی ناکرێت، لە کاغەزی لێکۆڵینەوەی تێکدانی ئاسایش دەرکەوتووە کە لە بەرامبەریاندا مامەڵەی یاسایی ئەنجام داوە، لە بارەی کەسەکانەوە تایبەت بە لێکۆڵینەوەی نیزامیە ئاگاداری دراوەتە والا، بە بریارنامەی فەرمانگەی مولکیەی شورای دەوڵەت راگەیەندراوە، نووسراوی سەدری ئەعزەم لە ٢٢ کانوونی دووەم ١٣١٧ ژمارە ٣٢٩٢ نووسراوەتەوە، بە گوێرەی ئەوە هیممەت دەکرێت لە جێبەجێ کردنی.</td></tr>
</table>




| DH.TMIK.M. | 00138.00012 | **کۆتایی شەوال 1320** |
| --- | --- | --- |

فەرمانگەی گشتی ئەرکانی جەنگی
یەکەی چوارەم
٢٨٣٨
ڕاگەیەندراوی بەندەیە
حەمە ئاغا لە ئاغاکانی کۆی سانجەق لەگەڵ کۆمەڵێک لە پیاوەکانی سەرەتا گوندەکانیان سووتاندووە و ٤٠ تا ٥٠ کەسیان کوشتوە، پارەوپول و مەروماڵاتیان تاڵان کردووە، بۆیە دوای ئەوەی حەمە ئاغای کۆی سانجەق لە کەرکووك یەك دوو مانگ زیندانی کراوە، ئێستا لە ژێر نەزارەتە، لەسەر گفتوگۆکردن لەگەڵ ئاغاکانی تر هێرشی کردۆتە سەریان، دووبارە هێرشی کردۆتە سەر گوندەکانی هۆزی دیزەیی و هەندێك لە تاکەکانی هۆزەکەی کوشتوە و ئەو سەربازە شاهانانەی کە پارێزگاریان بوونە، یەکێکیان شەهید کردووە، بۆ ئەم مەبەستە سەرۆکی شێخ بزێنی عەبدولوەهاب ئاغازادە رەشید و پێنج کەس لە هاوەڵانی تەلەگرافنامەیان واژوو کردووە و لە سلێمانی دەرچووە، لەسەر فەرمانی سەدارەت هاوپێچ پێشکەش کراوە، لەم بارەیەوە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە کۆتایی شەوال ١٣٢٠ و لە ١٦ کانوونی دووەم ١٣١٨
رزا سەر عەسکەر

DH.ŞFR.00283.00059.001

| DH.ŞFR. | 00283.00059 | 25 موحەررەم 1320 |
| --- | --- | --- |
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>دوای رووداوە راگەیەندراوەکان، فرقەی قۆماندانیەت بۆ رووداوە راگەیەندراوەکان لەگەڵ هێزی سوارە بۆ کۆی سانجەق دەڕۆن و روو دەکەنە ناوچەکە، زانیاری رادەگەیەندرێت فەرمان، لە ٢١ نیسان ١٣١٨.<br>عوسمان موتەسەرفی کەرکووک | | |

DH.ŞFR.00283.00093.001

DH.ŞFR.00283.00093.001

| 28 موحەررەم 1320 | 00283.00093 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
دوای هاتنی هەواڵێكی زۆر موتەسەرفی كەركووك لە یەكەم رۆژ دەستی بە جولە كرد و ئەم بەیانیە، بەرەو كۆی سانجەق كەوتە رێ، موحسین پاشا ٣٨٠ سوارە و یەك تابوری سەربازی بەیەكەوە ناردووە، بەڵام پێش ئەوەی ناوبراو بگاتە شوێنەكە لە نێوان هۆزەكان رووبەرووبوونەوە روویداوە، دوای رووبەرووبوونەوەكەش هەر یەكە كشاوەتەوە شوێنەكەی خۆی، دوای روودانی ئەم رووداوە سەربازەكەیان نەیانزانیوە چی بكەن، ئەگەر بێتو لەسەر ئاماژەی مەن پاشای موتەسەرف لە كاتی خۆیدا جولەی بكردبووایە و بگەیشتبوایە شوێنەكە رێگە لە رووبەرووبوونەوەكە دەگیرا، قەزاكانی كۆی سانجەق و رانیە بە وەكالەت بە رێوەدەچن، ئەگەر بێتو قائیمقامی لێهاتوو هەبێت، هۆكار نادرێتە دەست بۆ ئەوەی ئەم جۆرە رووداوانە روو بدەن، بۆ ئەوەی ئاسایش بەرقەرار بێت و رێگە نەدرێت ئەم رووداوانە روو بدات، یاریدەدەری ویلایەت حەمدی بەگ رۆیشتووە، راگەیەندراوە فەرمان، لە ٢٣ نیسان ١٣١٨.
رەشید والی موسڵ

DH.ŞFR.00288.00036.001

DH.ŞFR.00288.00036.001

| | | |
|---|---|---|
| DH.ŞFR. | 00288.00036 | 22 ڕەبیعی یەکەم 1320 |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

لە ٣٠ مایس ١٣١٨، بۆ دەستگیر کردنی میرزا قادر ئاغا و ڕەسوڵ ئاغای کۆی سانجەق هێزی سەربازی بۆ گوندی خەسران ڕۆیشتووە، لە سەرەتاوە ئەوانە لەگەڵ هاوەڵانیان ڕایانکردووە ئەوەی لە دانیشتووانی ماوەتەوە ٨ کەسیان بۆ کۆی سانجەق بردووە، بۆ لێکۆڵینەوە لە بارودۆخەکەیان ٣ تفەنگیان ڕادەست کردۆتەو و نێردراوەتەوە کۆگا، لەلایەن موحسین پاشا ئاماژەی پێکراوە، بەڵام بە گەڕانەوەی سەربازەکانیش ئەوا ناوبراوان گەڕاونەتەوە گوندەکەیان، لە قائیمقامیەتی کۆی سانجەق ڕاگەیەندراوە، بۆ دەستگیرکردنیان پاشای ناوهاتوو نووسراوی کردووە، ڕاگەیەندراوە فەرمان.

لە ١٦ حوزەیران ١٣١٨

ڕەشید بە ناوی ولایەتی موسڵ




تلغرافنامه

| 13 رەمەزان 1320 | 00299.00001 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>لە مێژووی ١٩ تشرینی دووەم ١٣١٨ تەلەگرافنامە راگەیەندراوە، موسیو تیرەل لە باڵیۆزخانەی ئینگلتەرای وان لە رواندزەوە رۆیشتووە لە قەزاکانی کۆی سانجەق و رانیە و مەعمورەی حەمیدیە سوراوەتەوە، هاتۆتە هەولێر دوای ئەوەی لە خانەی حکوومەت میوان بووە هاتۆتە مەرکەزی ویلایەت، ئەگەرچی لەو قەزا ناوهاتووانەدا نووسرای گەشتوگوزاریەکەی هێشتا لە موتەسەرفیەتی سلێمانیەیە و وەڵام وەرنەگیراوە، بەڵام تێروانین لە ئاماژەی قائیمقامیەتی هەولێر هیچ شتێکی لێ نەبینراوە، راگەیەندراوە فەرمان، لە ١ کانوونی یەکەم ١٣١٨.<br>نوری والی موسڵ | | |



| 4 موحەررەم 1320 | 00478.00039 | DH.MKT. |
| --- | --- | --- |

٤ موحەررەم ١٣٢٠
٣١ مارت ١٣١٨
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
فەرمانگـەی دادی کـۆی سـانجەق خەریکـە دەروخێـت، بـۆ خەرجـی نۆژەنکردنـەوەی ١٤٣٢ قـوروش لـە موازەنـەی ناوەخـۆی سـاڵی ٣١٧ تۆمـار کـراوە، ٢٠٠٠ قـوروش بـۆ گواسـتنەوەی تاوانبـاران ڕێکخـراوە و هەژمـار کـراوە، لـە ویلایەتـی موسـڵی بەهیـە لـە تەلەگرافنامـەی ٢٣ شـوبات ١٣١٧ نیشـان دراوە، ئەگـەر بێتـو خەرجیەکـی زیاتـر ڕێکبخرێـت، خـەرج کـردن و هەژمـار کردنـی بـە ووتـەی نەزارەتـی ژمێریـاری ڕەزامەنـدی پـێ دەدرێـت.



| DH.MKT. | 00480.00044 | 7 موحەررەم 1320 |
|---|---|---|

٧ موحەررەم ١٣٢٠
٣ نیسان ١٣١٨
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
وەڵامی نووسراوی ٢ شوبات ١٣١٧ ژمارە ١٤٥، بۆ دامەزراندنی رزا لە تۆماری ناسنامەی سانجەقی کەرکووك و ئەمین ئەفەندی دوورخراوە لە تۆماری ناسنامەی کۆی سانجەق، ناوبراوان لە مێژووی دەست بەکاربوونیان هەر یەکە مانگانە ٢٥٠ قوروش مووچەیان بۆ دابین دەکرێت، لە بارەی جێبەجێ کردن و وەستاندن بە گوێرەی نیزام دەبێت و لەگەڵ فەرمانی سوێند خواردن ئەمین ئەفەندی مامەڵەکەی بە کەفالەت جێبەجێ دەکرێت، هەروەها لە بارەی دەست لەکار هەڵگرتنی ئەوانەی پێش ئەمین ئەفەندی لە کۆی سانجەق وەکو فەرمانبەری ناسنامە کاریان کردووە، لە ساڵی ٣٠٠ تا مێژووی دامەزراندنی ئەمین ئەفەندی ئەوانەی کاریان کردووە ناوەکانیان و لەگەڵ مێژووی دەست بەکاربوون و دەست لە کارهەڵگرتنیان بە پۆستە بە ووتەی ژمێریاری رادەگەیەندرێت.



| DH.MKT. | 00492.00042 | 22 موحەڕڕەم 1320 |
| --- | --- | --- |

۲۲ موحەڕڕەم ۱۳۲۰
۱۸ نیسان ۱۳۱۸
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
بـە واژووی حاجـی فەتـاح ئاغـازادە موسـا لـە مەرکـەزی کۆی سـانجەق تەلەگرافنامـە دەرچـووە، کۆپیەیەکی بـردراوە و خوێندراوەتـەوە، بـە گوێـرەی ئـەو راسـتیانەی دەرکەوتـووە لـە بـارەی جێبەجـێ کـردن و راگەیانـدنـی لـە وەڵامـی راگەیەنـدراوی پێشـوو لـە ۲۱ مـارت ۱۳۱۸ ژمـارە ۷ نووسراوی بەهیە هاوپێچ لـە وەڵامی ناوبراو روون کردنـەوەی داوە، رایگەیانـدووە بـە دابیـن کردنـی خەرجی رێـگا دەچێتە دەرسـەعادەت و لە بـارەی بارودۆخی ویلایـەت روون کردنەوە دەدات، بەڵام بە راگەیاندنی ئەو راگەیەندراوە گرنگانە کاتێک بانگهێشـتی دەرسـەعادەت دەکرێن و خەرجی رێگایان بـۆ خـەرج دەکرێـت، دوای ئـەوەی دێنـە ئێـرە ووتـەی ئـەو جـۆرە کەسـانە نادروسـت دەردەچێـت و بـە پێچەوانـەوە هەندێـك لـەم کەسـانە داواکاریـان دەبێـت، بەم تێروانینـە ئەگەر ووتـەی ناوبراو هـەر چییەك بێت، ئەوا بە پێویسـت زانـراوە لـە کاغەزێکـی مۆرکـراو راسـتەوخۆ بینێرێت، داواکـراوە کە خۆی هیممەت بکات لـە بـارەی روون کردنەوەکە.




DH.MKT.00508.00026.001

| | | |
|---|---|---|
| DH.MKT. | 00508.00026 | 29 موحەررەم 1320 |

نەزارەتی کاروباری دارایی
قەڵەمی نووسین
ژمارە ١٨٥
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
جەنابی ئەفەندم
ئـەو لیسـتەی کـە لەلایـەن چاودێری دارایـی ویلایەتـی موسـڵ تەحسـین ئەفەنـدی نێـردراوە، لـە دەسـتەواژەیەکی دا ئـەو کاتـەی کـە لـە پاشـکۆی وەکیلـی قائیمقامـی کـۆی سـانجەق بـووە، ٤٠٠٠٠ قوروشـی وەرگرتـووە بـە تەواوەتـی دابەشـی سـەر ئەفسـەر و فەرمانبـەر و پۆلیسـی پاراسـتنی کـردووە، لـە بەرامبـەر ئەوەشـدا سـەنەدی لـێ وەرگرتـوون، بـە مەبەسـتی هەژمارکردنـی بـۆ بەرێوەبـەری دارایـی نـاردووە، ئەمـەش پێچەوانـەی نیـزام و رێسـای خەرجـی فەرمانبەرانـی مولکیەیـە، بۆیـە لـە بـارەی ناوبـراوەوە مامەڵـەی پێویسـت ئەنجـام بدرێـت، بـۆ ئەمـەش بـە بریـاری ئەنجوومەنـی دارایـی لـە ژمێریـاری گشـتی دارایـی گفتوگـۆی لەسـەر کـراوە، لـەم بارەیـەوە ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ٢٩ موحـەررەم ١٣٢٠ و لـە ٢٥ نیسـان ١٣١٨.
نازری دارایی



DH.MKT.00571.00084.002

| DH.MKT. | 00571.00084 | 21 رەبیعی دووەم 1320 |
|---|---|---|
| ویلایەتی موسڵ<br>قەڵەمی نووسین<br>ژمارە ٦١<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>جەنابی ئەفەندم<br>لە بارەی عەبدولرەحمان بەگ قائیمقامی پێشووی كۆی سانجەق، لێكۆڵینەوەكان تەواو بوونە، لەگەڵ داواكاری ٢٧ مایس ١٣١٧ ژمارە ٢٥ پێشكەشی جەنابی نەزارەتپەناهی كراوە، بۆ گەرانەوەی ئەو كاغەزانە بە شایان زانراوە دەوڵەت هاوكار بێت، لەسەر ئاماژەی موتەسەرفیەتی كەركووك و ووتەی داواكاری گشتی مولكیە راگەیەندراوە، لەم بارەیەوە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو كەسەیە كە فەرمان دەردەكات.<br>لە ٢١ رەبیعی دووەم ١٣٢٠ و لە ١٣ تەمموز ١٣١٨<br>بە ناوی ویلایەتی موسڵ | | |



| DH.MKT. | 00636.00073 | 20 شەوال 1320 |
|---|---|---|

٢٠ شەوال ١٣٢٠
٦ كانوونی دووەم ١٣١٨
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
بـە شـێوەیەكی مەترسـیدار گرتووخانـەی قـەزای كـۆی سـانجەق وێـران بـووە و بـۆ نۆژەنكردنـەوەی بـە پێویسـت زانـراوە بـۆ خـەرج كردنـی ٣٠٠٠ قـوروش، لـە بودجـەی ئـەم سـاڵەی ویلایـەت تۆمـار بكرێـت، لـە رێكخسـتنی نۆژەنكردنەوەشـی كۆتایـی پـێ بێـت، یـەك سـاڵ دەبێـت قائیمقامیەتـی قـەزای ناوهاتـوو بـە وەكالـەت بەرێوەدەچێت، مووچەكەی لە خەزینـە هەڵگیـراوە، جگـە لـە نیوەكـەی لـە بەرامبـەر هیـچ شـتێك بەكارنەهاتووە، هـاوكار بـن كـە بـرە پـارەی ناوبـراو لـە مووچەی باسـكراودا ببڕێتـەوە، بـە تێروانین لـە نـووسراوی ٢٣ تشرینـی دووەم ١٣١٨ ژمـارە ١١٤ كـە ئاماژەی پێكـراوە، بـە ووتـەی نەزارەتـی ژمێریـاری چۆنیەتـی مۆڵەتدانەكـە ئامـاژەی پێكـراوە.



| DH.MKT. | 00661.00067 | 4 زیلحیجه 1320 |
| --- | --- | --- |

٤ زیلحیجه ١٣٢٠
١٨ شوبات ١٣١٨
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
لە بارەی ئەو قسە نابەجێی و نادروستانەی کە لە بارەی سەربازی شاهانە دەکرێت، زانا و دانیشتوانی خۆچێی لەگەڵ سەرۆکی شارەوانی کۆی سانجەق کۆبوونەوەیان کردووە، لەسەر هەواڵی بینباشی نیزامیەی ئەوێ بە راگەیاندنی موشیرەتی جەلیلە، لەلایەنی سەربازی و مولکیە ئەرکیان پێ دراوە و نێردراون، لە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە کراوە، دەرکەوتووە دانیشتوانی کۆی سانجەق و هۆزی شێخ بزێنی لە نێوانیاندا دووبەرەکی و ناکۆکی هەیە، لەسەر ئەو قسە نابەجێ و نادروستانەی کە پروپاگەندەیان لەسەر دەکرێت، هێشتا تفەنگی سەربازێك دزراوە و لەسەر ئەمە ٥ کەس لە نەزارەت دەست بەسەرە، لە بارەی غەدرەوە تەلەگراف دەرچووە، ئەوەی باس دەکرێت و قسەی لەسەر دەکرێت تەنیا قسەیە، دەرکەوتووە کە شتێکی گرنگ رووی نەداوە، بۆیە تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵی بەهیە هاتووە، لەسەر فەرمانی سەروو وێنەیەکی هاوپێچ پێشکەش کرا.




<table>
<tr><td>20 رەجەب 1320</td><td>00779.00055</td><td>DH.MKT.</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەتی پایەبەرز<br>قەڵەمی نووسین<br>ژمارە ٢٤٧٤<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>جەنابی ئەفەندم<br>لە قەزاکانی کۆی سانجەق و رانیە بە زیادکردنی گشتگیر ئەم ساڵ موقاتەعاتەکانی ئیلتیزام داهاتیان کەم بووە، ئەو زیادکردنەی کە کراوە وایکردووە بەرێوبەرەکانیش دەست لە کاروبارەکان وەربدەن، ئەمەش وایکردووە دووچاری زەرەر بێتەوە، بۆیە لە رێگەی سوودی خەزینە کە بەردەوام لە خزمەت دابوونە، لەبەر غەدرکردن و پاراستن لە دەستدرێژی بەرێوبەرەکان، بە واژووی ئەشرافی کۆی سانجەق عەبدولفەتاح ئاغازادە موسا لە مەرکەز تەلەگرافنامە دەرچووە لەسەر داواکاری ناوبراو لێکۆڵینەوە لە بابەتەکە بکرێت و هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی، بۆ ئەم مەبەستەش نووسراو ئامادەکرا ئەفەندم.<br>لە ٢٠ رەجەب ١٣٢٠ و لە ٢٩ ئەیلوول ١٣١٩<br>سەدری ئەعزەم</td></tr>
</table>




BEO.001829.137114.002

| 4 موحەررەم 1320 | 001829.137114 | BEO. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٥٨٥
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
راگەیەندراوی بەندەیە
فەرمانگەی دادی کۆی سانجەق وێران بووە، بۆ خەرجی نۆژەنکردنەوەی ١٤٣٢ قوروش لە موازەنەی ناوەخۆی ساڵی ٣١٧ کە ٢٠٠٠ قوروش لە خەرجی گواستنەوەی تاوانباران تۆمارکراوە، لەو پارەیە رێکخراوە و هەژمار کراوە، بۆ ئەمەش لە ویلایەتی موسڵی بەهیە تەلەگرافنامە لە ٢٣ شوبات ١٣١٧ وەرگیراوە، تێدا نیشان دراوە و بۆ رێکخستنی هەموو خەرجیەکانی تریش رێکخراوە و هەژمار کراوە، بە ووتەی نەزارەتی ژمێریاری شێوەی رەزامەندی دیاریکراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، ٤ موحەررەم ١٣٢٠ و لە ٣١ مارت ١٣١٨.
نازری کاروباری ناوەخۆ


صدارت مكتوبی قلمی



2 vrk
(2 sht boş)

| 29 رەبیعی یەکەم 1320 | 001882.141085 | BEO. |
|---|---|---|

٢٩ رەبیعی یەکەم ١٣٢٠
٢٢ حوزەیران ١٣١٨
بۆ نەزارەتی دادی جەلیلە لایەنی عالی
نووسراو
١٩ رەبیعی یەکەم ١٣٢٠ ژمارە ٢٢٥ وەڵامی نووسراوی عالییە، لە ساداتی بەرزنجی شێخ ئەحمەد ئەفەندی لەگەڵ حەمە ئاغای کۆی سانجەق لە نێوانیان گفتوگۆ کراوە و ناوبراوان پیاویان لە هەندێك هۆز کۆکردۆتەوە و گوندەکانیان سووتاندووە و تالان کردووە و خەڵکێکی زۆریان کوشتووە، لەبەر ئەوەی بوونەتە هۆکاری ئەم هەموو تاوانە، لە لایەنی دادەوە مامەڵەی یاسایی جێبەجێ دەکرێت، لەسەر ئاماژەی نەزارەتی ناوخۆی جەلیلە، لە وەڵامدا لە مێژووی ٢٠ رەبیعی یەکەم ١٣٢٠ ئاگاداری دراوەتە سەروو.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1894 | 142049 | 2

| 21 ڕەبیعی کۆتایی 1320 | 001894.142049 | BEO. |
|---|---|---|

فەرمانگەی گشتی ئەرکانی جەنگی
یەکەی یەکەم
١٠٨٢
ڕاگەیەندراوی بەندەیە
لەسەر ڕووداوەکانی کۆی سانجەق ڕەسول و هاوەڵانی ڕایانکردووە و چوونەتە ساوچبۆلاق، بە تەلەگراف ڕاگەیەندراوە بیرۆکەی ئەوەیان هەیە بچنە لایەك، هەروەها بۆ دەستگیرکردنیان ئاگاداری پێویست دراوەتە شەهبەندەری ئەوێ، لەسەر ئاماژەی فەریق جەنابی محەمەد پاشا تەلەگرافنامە لە موشیرەتی جەلیلەی لەشکری شەشەمی هومایۆن هاتووە، تێدا ڕوون کراوەتەوە، بە تێروانین لە وێنەی ئاماژە پێکردنەکە، لەسەر ڕای سەدری ئەعزەمی سەدارەتپەناهی هەر ئێستا دەست بە جێبەجێ کردنی بکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٢١ ڕەبیعی کۆتایی ١٣٢٠ و لە ١٤ تەمموز ١٣١٨
ڕزا سەر عەسکەر




BEO.001896.142153.002

<table>
<tr><td>BEO.</td><td>001896.142153</td><td>21 رەبیعی کۆتایی 1320</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی داد و مەزهەبەکان<br>بەڕێوەبەرایەتی کاروباری سزا<br>ژمارە ٣٠٥<br>بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی<br>ڕاگەیەندراوی بەندەیە<br>ئەو قسانەی لەسەر ناکۆکی نێوان ساداتی بەرزنجی شێخ ئەحمەد ئەفەندی لەگەڵ خەڵکی کۆی سانجەق حەمە ئاغادا کراوە، ئەو ناکۆکیەی نێوانیان وای کردووە کە هەردووکیان پیاو لە هەندێك هۆز کۆبکەنەوە، دواتریش هێرشیان کردۆتە سەر گوندەکان و کەلوپەل و پارەوپولیان تاڵان کردووە و خەڵکیان کوشتوە، بۆیە لە لایەنی دادەوە پێویستە مامەڵەی یاسایی جێبەجێ بکرێت، لە ١٣ حوزەیران ١٣١٨ لەگەڵ وەڵامی سەدری ئەعزەمی سەدارەتپەناهی فەرمان و نووسراو کراوە، لە ویلایەتی موسڵیش لە داواکاری گشتی ئیستیناف ئاگادار کراوەتەوە، لە کۆتادا نووسراوی سەدری ئەعزەمی سەدارەتپەناهی لە مێژووی ٢ تەمموز ١٣١٨ نێردراوە و تێدا هاتووە بەدواداچوونی یاسایی بکرێت و لێبووردن نەیانگرێتەوە، ئەوانەی ملکەچ نابن ئابڵوقە بدرێن، تەنیا ئەوانەی دەستیان لە کارەکە هەیە لە ناو هۆزەکان بدرێنە دادگا، لەسەر هەندێك ووتە تەلەگرافنامەی جەنابی موحسین پاشا بە گواستنەوە تەلەگرافنامەی ویلایەتی موسڵ لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆ نێردراوە، بە تێڕوانین لە ڕاگەیەندراوی عالی و ئاماژەی پێشووی بابەتەکە، فەرمان دراوە بابەتەکە جێبەجێ بکرێت، لەسەر نووسراوی یەکەمی سەدری ئەعزەم ئاگاداری دراوە کە پێویستە بەدواداچوونی خۆچێی ئەنجام بدرێت، لەم حاڵەتەدا خوێندنەوەی قوماندانیەتی لەسەر دەکرێت، بە گوێرەی ئەوە ئاگاداری دەدرێتە خۆچێی، ئەمر و ڕاگەیاندنی بۆ سەدارەتە، لەم بابەتە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٠ ڕەبیعی کۆتایی ١٣٢٠ و لە ١٣ تەمموز ١٣١٨.<br>نازری داد</td></tr>
</table>


صدارت مکتوبی قلمی

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1910 | 143209

| BEO. | 001910.143209 | 22 جەمادی یەکەم 1320 |
| --- | --- | --- |

٢٢ جەمادی یەکەم ١٣٢٠
١٣ ئۆغستۆس ١٣١٨
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لـە ویلایەتـی بەغداد بۆ قائیمقامیەتی قەزای سـەماوە، مومتاز ئەفەندی قائیمقامی کازمیە هەروەها بۆ قائیمقامیەتی کازمیـەش بەرێوەبـەری پێشـووی ناحیـەی ....... ئەحمـەد سـالم، بـۆ قائیمقامیەتی کۆی سـانجەق قائیمقامی پێشـووی شـەترەی مونتەفیـك خورشـید ئەفەنـدی دادەمەزرێـن، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش لەسـەر نـووسراوی دەوڵـەت لـە ٢٣ ڕەبیعـی کۆتایـی ١٣٢٠ ژمـارە ٢٦١١ بڕیـاری قۆمیسـیۆنی فەرمانبەرانـی مولکیـە دوای ڕەزامەنـدی، فەرمانـی پاشـای جەنابـی خەلافەتپەناهـی لـە ١٨ جەمـادی یەکـەم ١٣٢٠ فەرموویەتـی، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.




| 26 رەجەب 1321 | 00049.00050 | DH.TMIK.S. |
|---|---|---|
| ویلایەتی موسڵ<br>قەڵەمی تۆمار<br>ژمارە ١٣٥<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>بۆ جەنابی ئەفەندم<br>ئەمجارە لە موتەسەرفیەتی کەرکووك بوودجەی شارەوانی قەزای کۆی سانجەق نێردراوە، هاوپێچ پێشکەشی جەنابی نەزارەتپەناهی کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٦ رەجەب ١٣٢١ و لە ٤ تشرینی یەکەم ١٣١٩.<br>نوری والی موسڵ | | |



| | | |
|---|---|---|
| 17 شەعبان 1321 | 00049.00057 | DH.TMIK.S. |

١٧ شەعبان ١٣٢١
٢٥ تشرینی یەکەم ١٣١٩
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
١ شـەعبان ١٣٢١ نـووسراوی هاوپێچـە، مەرکـەزی سـیروز و پاشـکۆکانی لەگـەڵ قـەزای کۆی سـانجەق، لـە بوودجەی فەرمانگـەی شـارەوانی سـاڵی ٣١٩ نێـردراوە، لـە شـوێن خۆیـان دوو پارچـە نـووسراو لـە شـورای دەوڵـەت ووردبینـی بـۆ کـراوە، لەگـەڵ هاوپێچیەکانیـەوە بەیەکـەوە بـە ووتەی مامەڵەی قۆمیسـیۆن پێشکەشـی سـەدارەتپەناهی کـراوە.




DH.TMIK.M.00162.00014.001

<table dir="rtl">
<tr><td>DH.TMIK.M.</td><td>00162.00014</td><td>8 زیلقەعدە 1321</td></tr>
<tr><td colspan="3">فەرمانگەی گشتی ئەرکانی جەنگی<br>یەکەی چوارەم<br>٣٥٢٨<br>راگەیەندراوی بەندەیە<br>چاککردنی پەیوەندی نێوان هۆزەکانی کۆی سانجەق و شێخ بزێنی ئەنجام دراوە، بۆ ئەم کارە تابوری دووەمی ئاڵای ٤٥، لە قەڵای ساتۆ بوونی هەیە، لە موتەسەرفیەتی کەرکووك داواکراوە بۆ ئەوەی هەژمارکردنی ئاژەڵی دانیشتووانی رانیە جێبەجێ بکات، بۆ ئەم مەبەستە لە وەکالەتی قوماندانیەتی فرقەی ١٢ تەلەگرافنامە هاتووە، رەزامەندی دراوە، هەروەها بە تێروانین لە فەرمانی هەژمارکردنی ئاژەڵەکانی دانیشتووان، هەموو کات یاریدەدەری سەربازی داوا دەکرێت، بۆ ئەمەش فەرمان دراوە بە ناردنی هێزی ناوهاتوو بۆ رانیە، لە تەلەگرافنامەی موشیرەتی جەلیلەی لەشکری شەشەمی هومایۆن هاتووە، تێدا ئاماژەی پێکراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٨ زیلقەعدە ١٣٢١ و لە ١٣ کانوونی دووەم ١٣١٩.<br>رزا سەر عەسکەر</td></tr>
</table>



DH.MKT.00659.00068.003

| DH.MKT. | 00659.00068 | سەرەتای موحەررەم 1321 |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ١٦
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
جەنابی ئەفەندم

قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق لەگەڵ سەرۆکی شارەوانی و فەرمانبەرانی داد و لەگەڵ ستەمکارەکان یەکیان گرتووە و زانا و شێخ و خەڵکی خۆچێیان کۆکردۆتەوە بە نهێنی گفتوگۆیان کردووە، پوختەی بابەتەکە لە موشیرەتی جەلیلەی لەشکری شەشەمی همایۆن هاتووە، دواتر لە سەر عەسکەرەوە بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی نێردراوە، وێنەی تەلەگرافنامەکە هاوپێچ لەگەڵ نووسراوی زانیاری لە مێژووی ١٥ شوبات ١٣١٨ ژمارە ٢١٨ فەرمانامەی عالی جەنابی نەزارەتپەناهی خوێندنەوەی بۆ کراوە، لەگەڵ تەلەگرافنامەی ١٢ شوبات ١٣١٨ی بەندەمان راگەیەندراوە، لەم بابەتە لەگەڵ موشیرەتی ناوهاتوو گفتوگۆ کراوە، لەسەر ئەم گفتوگۆیە لەلایەنی سەربازی و مولکیە لە هەر یەکە فەرمانبەرێك بۆ قەزای ناوهاتوو نێردراوە، بە گوێرەی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە کراوە، کۆبوونەوەی باسکراو لەسەر ناکۆکی و نەهێشتنی دوژمنایەتی نێوان دانیشتوانی کۆی سانجەق و هۆزی شێخ بزێنی بووە، هیچ شتێکی ئاوا گرنگ نەبووە، لەم بابەتە زانیاری لەلایەن بینباشی نیزامیە هاتووە، ئەو کاغەزانەی کە پەیوەستن بە لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتە لە خۆچێی بۆ موشیرەتی جەلیلە نێردراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

لە سەرەتای موحەررەم ١٣٢١ و لە ١٧ مارت ١٣١٩
والی موسڵ بە مۆری نوری




| DH.MKT. | 00711.00015 | 12 سەفەر 1321 |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>فەرمانگەی نەزارەتی ناوەخۆ<br>قەڵەمی فەرمانبەران<br>ژمارە ١٧٤<br>لەلایەن قائیمقامەکانی قەزای بەدرە پاشکۆی ویلایەتی بەغداد و قەزای کۆی سانجەق سەر بە ویلایەتی موسڵ تۆفیق ئەفەندی و خورشید ئەفەندی بە هاوبەشی داواکاریان بەرز کردۆتەوە، دوای حەواڵە کردن رەزامەندی لەسەر داوای گۆرینەوەی ئەرکەکەیان دراوە. بە تۆمار روون بۆتەوە کە قەزاکانی ناوهاتوو لە چینی سێیەمن، ناوبراوانیش لە هەڵبژێردراوەکانن، بۆیە دوای دەنگدانی جەنابی نەزارەتپەناهی عالی بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە وێنەی پەسەندکراوی داواکاری ناوهاتوو بە هاوپێچ پێشکەش کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>لە ١٢ سەفەر ١٣٢١ و لە ٢٦ نیسان ١٣١٩ | | |



| 18 شەوال 1321 | 00807.00051 | DH.MKT. |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
جەنابی سەدارەتپەناهی
راگەیەندراوی بەندەیە

دوای مردنی رەفعەت ئەفەندی قائیمقامی قەزای عانە لە شوێن ئەو مستەفا ئەفەندی کە لە مەکتەبی دواناوەندی دەرچووە و لە بەرێوەبەرایەتی بەدر لێبوردراوە، بە مەبەستی دامەزراندنی ناوبراو ئەگەرچی تەلەگرافنامە لە ویلایەتی بەغداد هاتووە و تێدا ئاماژەی پێکراوە، بەڵام مستەفا ئەفەندی هەڵبژاردننامەی قائیمقامیەتی وەرنەگرتووە، هەروەها نووسراو لە ویلایەتی موسڵ هاتووە کە قائیمقامی کۆی سانجەق محەمەد خورشید ئەفەندی بگوازرێتەوە شوێنێکی تر، قەزای عانەش لە چێنی سێیەمە و خورشید ئەفەندیش لە هەڵبژێردراوەکانە کە بە تۆمار دەرکەوتووە بەمەش خورشید ئەفەندی بۆ قائیمقامی عانە بگوازرێتەوە هەروەها قائیمقامی پێشووی کیجە، ئیبراهیم خەلیل بەگ کە هەڵبژێردراوە و نۆرەی هاتووە، کەسیش ئارەزووی نییە لە چینی سێیەم لە قائیمقامیەتی کۆی سانجەق دابمەزرێت بۆیە ناوبراو دابمەزرێت، وێنەی نووسراوەکانی ناوهاتوو لەگەڵ کاغەزی وەرگێردراوی پەسەندکراوی ئیبراهیم خەلیل بەگ هاوپێچ پێشکەش کراوە، جێبەجێ کردنی کارەکە بە رەزامەندی جەنابی وەکالەتپەناهیە، لەم بابەتە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٨ شەوال ١٣٢١ و ٢٥ کانوونی یەکەم ١٣١٩.
نازری کاروباری ناوەخۆ


OSMANLI ARŞIVI
BEO
2049 | 153675 | 2

BEO.002049.153675.002

| BEO. | 002049.153675 | 20 موحەررەم 1321 |
| --- | --- | --- |

شورای دەوڵەت
فەرمانگەی دارایی
ژمارە ٢٧٧
لە نەزارەتی ناوەخۆ راستەوخۆ و لە وەڵامدا بە پێشکەش کردن حەواڵە کراوە، لە ٢٠ شەوال و ٩ زیلحیجە ١٣٢٠ ژمارە ٥٥٥٧ و ٦٤٩١ دوو پارچە نووسراو لەگەڵ دەفتەری دەرخستە لە فەرمانگەی دارایی خوێندراوەتەوە و وردبینی بۆ کرا. لە بارەی بابەتەوە گرتووخانەی قەزای کۆی سانجەق بە شێوەیەکی مەترسیدار وێران بووە، خەرجی نۆژەنکردنەوەی ٣٠٠٠ قوروش لە بودجەی ساڵی ٣١٨ ویلایەت رێکخستنی نۆژەنکردنەوەی تۆمار کراوە، بەڵام کۆتایی نەهاتووە، ماوەی ساڵێکە قەزای ناوهاتوو بە وەکالەت بەرێوەدەچێت، مووچەی قائیمقامیەتەکەی لە خەزینە ماوەتەوە، بە ئاماژەی ویلایەتی موسڵ مۆڵەت دراوە کە نیوەی دابین دەکرێت، هەروەها بۆ جێبەجێ کردنی نۆژەنکردنەوەی باسکراودا لە پلەیەکی زۆر بە پێویست دەزانرێت، بۆ جێبەجێ کردنی خەرجی نێردراویش لە خەرجکردنی مووچەکان زیاتر رێگەی تر نییە، ئەمەش بە ئاسایی بینراوە، بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی جێبەجێ کردنی کارەکەش نووسراو و لاپەرەی دەرخستە حەواڵەی نەزارەتی ناوهاتوو کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٠ موحەررەم ١٣٢١ و لە ٥ نیسان ١٣١٩.




| BEO. | 002079.155895 | 2 رەبیعی یەکەم 1321 |
| --- | --- | --- |
| پایەی سەرعەسکەر<br>قەڵەمی نووسین<br>٣٩٣<br>ڕاگەیەندراوی بەندەیە<br>ئەندامانی تابوری دووەمی کۆی سانجەقی سەر بە ئالای ٤٠ی لەبەر بێ ئیدارەیەی بارودۆخیان گەیشتۆتە حاڵەتێکی زۆر تەنگانەیی، تا ١٠ ڕۆژی تر ئیدارەیان ڕێك نەخرێت ناچار دەبن دەست لە چەك هەڵگرن، لەم بارەیەوە ئەو ئاماژەیەی کە پێشووتر بۆ دەفتەرداریەتی موسڵ نێردراوە، کار بۆ جێبەجێ کردنی نەکراوە، دەرکەوتووە ئەو تابورە بەم شێوەیە تووشی تەنگانە بۆتەوە، هەروەها تەلەگرافنامەی موشیرەتی جەلیلەی لەشکری شەشەمی هومایۆن هاتووە، وێنەی دەرچووی هاوپێچ پێشکەش کراوە، هەروەها وێنەکەی شایەنی ئاماژە پێکردنە، تا ڕێگە نەدرێت حاڵەتێکی نەخوازراو ڕوو بدات، هەرچی زووە تابوری ناوهاتوو ئیدارەکەی ڕێك بخرێت، ئەوانەی لەسەریانە کارەکە جێبەجێ بکەن ڕێنماییان پێ بدرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢ ڕەبیعی یەکەم ١٣٢١ و لە ١٦ مایس ١٣١٩.<br>ڕزا سەر عەسکەر | | |


صدارت عظمی مکتوبی قلمی

| BEO. | 002108.158062 | 8 رەبیعی کۆتایی 1321 |
|---|---|---|

٨ رەبیعی کۆتایی ١٣٢١
٢١ حوزەیران ١٣١٩
بۆ لایەنی والای سەر عەسکەریمان
لە ناو قەزای کۆی سانجەق بۆ وەرگرتنی داهاتی خەڵکی بالیسان، عەبدوڵلا بەگ و عەبدولرەحمان بەگ، سەرەتا ئەو مەفرەزە نیزامیەی لەگەڵ ئەو فەرمانبەرانەی نێردراوە، بە هیچ شێوەیەك ئاسانکاریان بۆ کارەکانیان نەکراوە، لە بەرامبەر سەربازی شاهانە چەکیان بەکار هێناوە، یەك نەفەر شەهید بووە و دوو نەفەر برینداربووە، یەك ئێستریش لەناوچووە، لەلایەکی تریش هاوکاریان کۆکردۆتەوە، لەسەر ئەو زانیاریانەی کە بە موتەسەرفیەتی کەرکووك راگەیەندراوە، مەفرەزەیەکی تەواو هەر ئێستا رێك بخرێت و لەگەڵ ئەفسەری خۆچێی بەیەکەوە بەپەلە بنێردرێت تا ناوبراوان لەگەڵ هاوکارەکانیان بەیەکەوە بە زیندوویی یاخود مردوویی دەستگیر بکرێن، نووسراو بۆ موشیرەتی جەلیلە و جەنابی فەریق موحسین پاشا نووسراوە، ئەوەی بە ویلایەتی موسڵ راگەیەندراوە لە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە ئاماژەی پێ کراوە، بە راگەیاندنی ئاگاداری بەپەلە بە فەرمانگەی سەربازی جەلیلە راگەیەندراوە.






BEO.002117.158702.003

| BEO. | 002117.158702 | 22 سەفەر 1321 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ١٣٦٠
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
راگەیەندراوی بەندەیە

قائیمقامەکانی قەزای بەدرە سەر بە ویلایەتی بەغداد و قەزای کۆی سانجەق سەر بە ویلایەتی موسڵ تۆفیق ئەفەندی و خورشید ئەفەندی ئەو داواکاریەی کە ناردوویانە هاوپێچ وێنەیەکی پێشکەش کراوە، لە داواکاریەکە داواکراوە گۆرینەوەیان پێ بکرێت، هەروەها قەزا ناوهاتووەکان لە چینی سێیەمن و بە تۆماریش دەرکەوتووە ناوبراوان لە هەڵبژێردراوەکانن، جێبەجێ کردن دەگەرێتەوە بۆ سەدارەتپەناهی، لەم بابەتە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٢ سەفەر ١٣٢١ و لە ٧ مایس ١٣١٩.
نازری کاروباری ناوەخۆ




DH.TMIK.M.00190.00001.001

<table>
<tr><td>28 شەوال 1322</td><td>00190.00001</td><td>DH.TMIK.M.</td></tr>
<tr><td colspan="3">فەرمانگەی گشتی ئەرکانی جەنگی<br>یەکەی چوارەم<br>٢١٠٩<br>راگەیەندراوی بەندەیە<br>بـۆ وەرگرتنـی داهاتی یەك مانگی هۆزی بالیسـان ئەو مەفرەزەیەی چوونەتە سـەریان، چەکیـان بەرامبەر بەکارهێناوە، بۆیـە داواکـراوە مەفرەزەکـە بەهێزتـر بکرێـت، لەسـەر ئـەم داوایـە ئەو تابـورەی لە کۆی سـانجەقە بە هێزێکـی تەواو لـە قـەزا رێـك دەخرێـت، بـۆ جێبەجـێ کردنـی مەفـرەزەی هێـزی ژاندارمـە فەرمـان دراوە، لەسـەر ئامـاژەی ناوەخـۆ قوماندانیەتـی لەشـکری شەشـەمی هومایـۆن تەلەگرافنامـە وەرگیـراوە، وێنەیەکـی هاوپێـچ پێشـکەش کـراوە، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ٢٨ شـەوال ١٣٢٢ و لـە ٢٢ کانوونـی یەکـەم ١٣٢٠.<br>رزا سەرعەسکەر</td></tr>
</table>



| 1 موحەررەم 1322 | 00831.00028 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١ موحەررەم ١٣٢٢
٦ مارت ١٣٢٠
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
وەڵامی نووسراوی بەهیەی مێژووی ٢٤ کانوونی دووەم ١٣١٩ ژمارە ١٧٩، لە دەرەوەی موازەنە بە بێ بەرامبەر لە بارەی دابینکردن و خەرج کردنی ئاقچە، قۆناغی حکوومەتی قەزای کۆی سانجەق نیمچە وێران بووە، بۆ نۆژەنکردنەوەی پێویستە پارە خەرج بکرێت، ئاماژە بە خەرجیەکە ٥٠٠٠ قوروش لە موازەنەی ویلایەت تۆمار کراوە، بە گشتی یا بە بەرامبەر بێت یاخود خەرجی نۆژەنکردنەوەکە لە موازەنەی ساڵی هاتوو تۆمار دەکرێت و ئەو پارەیە رێك دەخرێت، پێویستە جێبەجێ بکرێت، بە ووتەی ژمێریاری راگەیەندراوە.





DH.MKT.00847.00014.001

| **DH.MKT.** | 00847.00014 | **10 سەفەر 1322** |
| --- | --- | --- |

نەزارەتی پۆستە و تەلەگراف
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٨٥
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
جەنابی ئەفەندم

لە هەولێر بۆ کۆی سانجەق ٧١٠٠٠ قوروش و هەندێك ئەمانەتی پۆستە بە پۆستەچی گوازراوەتەوە، لە هەولێرەوە ژاندارمەکان بە گوێرەی نەریت لەگەڵیان دەبن و پارێزگاریان لێ دەکەن، بەڵام نەیانگەیاندۆتە خاڵی دووەم و پارێزگاریان لێ نەکردوون و رادەستیان نەکردوون، دوای سێ کاتژمێر رۆیشتن پۆستەکەیان بەجێ هێشتووە و گەڕاونەتەوە، ئەگەرچی ئەم بابەتە لەلایەن پۆستەچی ناوهاتووەوە باسکراوە، بەڵام گوێیان لێ نەگرتووە، پۆستەی باسکراو لەگەڵ پۆستەچییەکە بەبێ پارێزگاری کردن بە تەنیا تا خاڵی دیاریکراو هاتووە، ئەم حاڵەتە چەندین جار دووبارە بۆتەوە و راگەیەندراوە کە دووبارە بوونەوەی ئەم حاڵەتە دەبێتە هۆی ئەوەی ئەنجامی خراپی لێ بکەوێتەوە لەوانە هێرشی چەتەکان، بۆ چارەسەرکردنی بەپەلەی ئەم حاڵەتە بە ئاماژەی بەڕێوەبەری پۆستە و تەلەگرافی کۆی سانجەق، هەر ئێستا لە تەلەگرافنامەی باش مودیرەت راگەیەندراوە، لەوانە کە ناوەکانیان دیارە هەمەوەندەکان بە چەتەگەری بەناوبانگن، دەورووبەری کۆی سانجەق بۆتە شوێنی جوڵەوانی ئەوان و چەتەگەری تێدا ئەنجام دەدەن، بەم شێوەیەش بوێری کراوە کە ئەو هەموو پارەیە لەسەر شانی پۆستە و بێ پارێزگاری بەجێ هێڵدراوە، پێویستە بە تێروانینەوە وردبینی بۆ بکرێت و بارودۆخەکە چارەسەر بکرێت، هەروەها لە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە کراوە دەرکەوتووە ئەو ئەفسەرە فەرمانبەرانەی ئەو کارانە دەکەن لێیان خۆش دەبن بۆیە ئەو یەك دوو ساڵە پۆستەکانمان تووشی زیان و زەرە دەبنەوە، پشت بەستن بەم راگەیەندراوە ئەگەر بێتو ئامادەکاری لەلایەن سەروو بکرێت و ئەوا لە ئێستاوە لەگەڵ ویلایەتی موسڵی عالیە بە تەلەگراف ئاگاداری دەدرێتە هەموو ویلایەتەکان، باش مودیرەکانیش رێنمایی بدەن، بۆ وەرگرتنی ئەمر و نووسراو، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٠ سەفەر ١٣٢٢ و لە ١٣ نیسان ١٣٢٠.
نازری تەلەگراف و پۆستە



DH.MKT.00848.00069.001

| DH.MKT. | 00848.00069 | 16 موحەڕڕەم 1322 |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ١٤
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
بۆ جەنابی ئەفەندم
حەمە ئاغای کۆی سانجەق لەگەڵ هۆزی شێخ بزێنی لە نێوانیان چەند ساڵە ناکۆکی و دووبەرەکی هەیە، بۆ نەهێشتنی دوژمنایەتی و ئاشت کردنەوەیان، لە فەرمانگەی عالی دلخوا بۆ جێبەجێ کردنی کاروباری قەزا، وەکیلەکانی قائیمقامی کۆی سانجەق و بازیان عەبدوڵڵا موخلیس بەگ و عەبدولرەحمان بەگ هیممەتیان کردووە و کۆششیان بینراوە، بۆیە شایەنی ئەوەن ڕێزیان لێ بگیرێت، لەلایەن پاشاوە فەرمانی ڕێزگرتنیان بۆ دەرچووە، عەبدوڵڵا موخلیس بەگ بە پلەی دووەم و عەبدولرەحمان بەگ بە پلەی چوارەم ڕێزیان لێ دەگیرێت، بە میهرەبانیەوە هەر یەکە پلەیەك بەرز دەکرێنەوە، یاخود دەچەسپێنرێت کە هەر یەکە بە نیشانێك ڕێزیان لێ بگیرێت، ئەمەش نەزارەتپەناهی ئەم ڕێزگرتنە بە شایان دەزانێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٦ موحەڕڕەم ١٣٢٢ و لە ٢٠ مارت ١٣٢٠.
نوری والی موسڵ




DH.MKT.00856.00007.001

| DH.MKT. | 00856.00007 | 9 ڕەبیعی یەکەم 1322 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەتی ناوەخۆ
ژمارە ٢٥٣
قـەدری بـەگ قائیمقامـی ڕەئـس ئەلعەیـن لەبـەر پیـری و تەمەنەکـەی لـە کارگێـری و بەڕێوەبردنـی کارەکان سسـت بۆتـەوە و کەموکوری بەدەرکەوتـووە، بۆیـە ماوەیەکـە کاری چەتەگـەری زیـادی کـردووە و جموجۆڵـی چەتەگـەری زۆر بـووە، هەرچـی خۆیەتـی ئـەوا لـە ڕووی سـوارەوە لـە سـەرکەوتن و دابەزینـدا بـە هیـچ شـێوەیەك توانـای نەمـاوە، ئەمـەش بۆتـە جێگـەی گاڵتەجـاری خەڵکـی قەزاکـە، بۆیـە بـەردەوام بوونـی لـە کارەکـەی گونجـاو نییـە، ناوبـراو بـۆ شـوێنێکی تـر کارەکـەی بگوازرێتـەوە و لـە شـوێن ئەویـش قائیمقامێـك دابنرێـت کـە لێهاتـوو و بـە توانـا بێـت، ئەمـەش لـەو تەلەگرافنامـە ئاماژەی پێـکراوە کـە لـە مێـژووی ١٤ نیسـان ١٣٢٠ لـە موتەسـەرفی زور هاتـووە. بـە تێروانیـن بـەم ئاماژەوە ناوبراو لە قـەزای ناوهاتوو گونجـاو نییە لە ئەرکەکـەی بمێنێتەوە، لەگەڵ دوورخسـتنەوەی بـۆ قائیمقامیەتـی قـەزای ناوهاتـوو کەسـێک دابمەزرێـت، کەچـی کەسـێك نییـە لـە مولازمـی چینـی دووەم بێـت و ئـارەزووی هەبێـت لـەم قەزایـە کار بـکات، بـەڵام خورشـید ئەفەنـدی قائیمقامـی کـۆی سـانجەق سـەر بـە ویلایەتـی موسـڵ لەبـەر ئـەوەی لەگـەڵ ئاووهـەوای ئـەوێ ئاوێتـە نابێت، تـکای کـردووە ئەرکەکـەی بگوازرێتەوە شـوێنێکی تر، هەروەهـا سـەبارەت بـە گواسـتنەوەی بـۆ قائیمقامیەتێکـی تـر بـە بڕیـاری قۆمیسـیۆنی فەرمانبەرانـی مولکیـە لە ٢٢ کانوونـی دووەم ١٣١٩ ژمـارە ٣٥٥٩ نـووسراوی سـەدری ئەعـزەم ڕایگەیانـدووە، کـە لـە ناو ویلایەتـی موسـڵ خورشـید ئەفەنـدی قائیمقامـی کـۆی سـانجەق کـە لـە هەڵبژێردراوەکانـە ڕەزامەنـدی لەسـەر گواسـتنەوەی دراوە، لەسـەر جێبەجـێ کردنـی کارەکـە ئـەوەی لـە تەلەگرافنامەکە باسـکراوە، وێنەی پەسـەند کـراوی پێشـکەش کراوە، لـەم بابەتە ئەمـر و فەرمان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کە فەرمـان دەردەکات، لـە ٩ ڕەبیعـی یەکـەم ١٣٢٢ و لە ١١ مایـس ١٣٢٠.


İ.DH.01426

<table>
<tr><td>I.DH.</td><td>01426.000018</td><td>1 جەمادی کۆتایی 1322</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>١٥٠٨<br>جەنابی ئەفەندم<br>لە ویلایەتی موسڵ قائیمقامیەتی قەزای سەڵاحیە بە کراوەیی ماوەتەوە، لەبەر ئەوەی خورشید ئەفەندی قائیمقامی کۆی سانجەقیش لەگەڵ کەشوهەوای ناوچەکە ئاوێتە نابێت، بۆیە داوای کردووە ئەرکەکەی بگوازرێتەوە، سەبارەت بە دامەزراندنی لەسەر نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە بریارنامە لە قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە دراوەتە قەڵەم، لەگەڵ کاغەزی وەرگێردراوی زانیاری کەسێتی بەیەکەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، بە هەر شێوەیەك بێت فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بۆ ئەمەش نووسراو کراوە ئەفەندم، لە ١ جەمادی کۆتایی ١٣٢٢ و لە ٣١ تەممووز ١٣٢٠.<br>سەدری ئەعزەم</td></tr>
</table>



<table>
<tr><td>I.DH.</td><td>01432.000021</td><td>29 زیلحیجه 1322</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>٣٤٠٦<br>جەنابی ئەفەندم<br>ئەمجارە لە ناو ویلایەتی موسڵ قائیمقامیەتی قەزای کۆی سانجەق بە کراوەیی ماوەتەوە، جگە لەمە لە ویلایەتی ئەنقەرە ئاماژە بەوە کراوە کە خەلیل ئەفەندی بەڕێوەبەری ناحیەی تەبانلی دامەزرێت، لەسەر نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە بریارنامە لە قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە ڕێکخراوە و لەگەڵ کاغەزی وەرگێردراوی زانیاری کەسێتی بەیەکەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، بە هەر شێوەیەك بێت فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، نووسراو کراوە ئەفەندم، لە ٢٩ زیلحیجە ١٣٢٢ و لە ٢١ شوبات ١٣٢٠.<br>سەدری ئەعزەم</td></tr>
</table>




BEO.001950.146216.002

<table>
<tr><td>9 شەعبان 1322</td><td>001950.146216</td><td>BEO.</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی دەرەوە<br>قەڵەمی نووسین<br>ژمارە ٢٧٤٤<br>بۆ جەنابی سدەارەتپەناهی<br>راگەیەندراوی بەندەیە<br>لە رووداوەکانی کۆی سانجەق رەسول و هاوەڵانی رایانکردووە، بۆ دەستگیرکردنیان بە ئاماژەی موشیرەتی جەلیلەی لەشکری شەشەمی همایۆن لایەنی سەرعەسکەری عالی جێبەجێ کردنی کارەکەی داوەتە شەهبەندەری ساوچبوڵاق، لە بارەی جێبەجێ کردن و راگەیاندنی نووسراوی سەدری ئەعزەمی جەنابی سەدارەتپەناهی مێژووی ٢٤ رەبیعی کۆتایی ١٣٢٠ ژمارە ٧٦٠ خوێندنەوەی بۆ کراوە، لەم بارەیەوە ئەو ئاگاداریەی کە پێشووتر بۆ باڵیۆزخانەی تەهران نێردراوە، لە وەڵامدا ئەو نووسراوانەی وەرگیراوە، هەر لە سەرەتاوە بۆ دەست بەسەرکردنی ناوبراوان لە ویلایەتی وان لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون دەستی پێکردووە، بەڵام هێشتا دەرنەکەوتووە لە کوێن، هەروەها بەردەوام بە دوایاندا دەگەرێن، ئەنجامەکەشی رادەگەیەندرێت، لە شەهبەندەری ناوهاتوو بە نووسراو وەڵام دراوەتەوە و ئەو کارانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی وەزارەتی کاروباری دەرەوە کراوە، ئەو وەڵامەی وەردەگیرێت دەکرێتە نووسراو، بۆ کۆتایی هێنان بەم کارە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>لە ٩ شەعبان ١٣٢٢ و لە ٢٨ تشرینی یەکەم ١٣١٨<br>تۆفیق پاشا نازری دەرەوە</td></tr>
</table>




| 18 جەمادی کۆتایی 1322 | 002401.180020 | BEO. |
|---|---|---|
| ١٨ جەمادی کۆتایی ١٣٢٢<br>١٧ ئۆغستۆس ١٣٢٠<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>نووسراو<br>لە ناو ویلایەتی موسڵ، سەبارەت بە دامەزراندنی قائیمقامی کۆی سانجەق خورشید ئەفەندی لە قائیمقامیەتی قەزای سەڵاحیە، لەسەر نووسراوی مێژووی ١٠ جەمادی یەکەم ١٣٢٢ ژمارە ٢٢٧٨ ی دەوڵەت، دوای مۆڵەت بە بریاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە، لە مێژووی ١٧ جەمادی کۆتایی ١٣٢٢ فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرموویەتی هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی. | | |




DH.ŞFR.00356.00058.001

| DH.ŞFR. | 00356.00058 | 28 شەعبان 1323 |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>لە ٥ تشرینی یەکەم ١٣٢١، بۆ پشکنینی هێڵی تەلەگرافی سنووری چەمچەماڵ، هێزی سەربازی و ئەفسەر بۆ ئەنجام دانی کارەکە تا تاشیجە ڕۆیشتوون، کاریگەری نەبینراوە، ئەمەش لە وەکالەتی موتەسەرفیەتی سلێمانیە بە وەڵام ڕاگەیەندراوە، هەروەها بۆ هێڵی مەعمورەی حەمیدیە لەگەڵ هێڵی کۆی سانجەق هێشتا وەڵام وەرنەگیراوە، ڕاگەیەندراوە فەرمان، لە ١٥ تشرینی یەکەم ١٣٢١.<br>نوری بە ناوی والی موسڵ | | |


داخلیه مکتوبی قلمی

| 15 رەبیعی یەکەم 1323 | 00958.00074 | DH.MKT. |
|---|---|---|
| 15 رەبیعی یەکەم 1323<br>7 مایس 1321<br>بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە<br>لە ویلایەتی موسڵ خەلیل ئەفەندی لە قائیمقامیەتی قەزای کۆی سانجەق دامەزراوە، لە ٪٦ جگە لە خەرجی ڕێگاکەی کە لە ١٣٤٤ قوروش پێك دێت لە نەزارەتی عاجیزانەی داهاتی ئەم ساڵەدا هەژمار کراوە و نێردراوە، بە ووتەی ژمێریاری پەلە کراوە لە ڕاگەیاندنی. | | |




DH.MKT.00998.00063.001

| DH.MKT. | 00998.00063 | 26 شەوال 1323 |
|---|---|---|

- بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
ژمارە ٣٧٩
لـە نـاو ویلایەتـی موسـڵ قائیمقامـی کۆی سـانجەق، خەلیـل سـامی ئەفەنـدی ئەرکەکـەی گوازراوەتەوە بـۆ قائیمقامی قـەزای کـەدوس، کەسـێك نیيە لە چینی سـێیەم، هەروەها دەرچـووی مەکتەب بێت و هەڵبژێردراو بێت ئـارەزووی ئەوە بـکات ببێتـە قائیمقامـی کۆی سـانجەق، بەرێوەبەری پێشـووی ناحیەی ئیدنجیك عەبدولسـتار ئەفەنـدی داوای کردووە لـە قەزایـەك بـە قائیمقام دابمەزرێت و کاغەزی زانیاری کەسـێتی هاوپێچ پێشـکەش کراوە، بۆیـە جەنابی نەزارەتپەناهی چەسـپاندنی فەرمـووە، لـە بـارەی جێبەجـێ کردنـی، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابی ئەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
لە ١١ جەمادی کۆتایی ١٣٢٣ و لە ٣٠ تەمموز ١٣٢١

- ٢٦ شەوال ١٣٢٣
١٠ کانوونی یەکەم ١٣٢١
بۆ ویلایەتی موسڵی عالیە
عەبدولسـتار ئەفەنـدی داوا کـراوە لـە قائیمقامیەتی کۆی سـانجەق دابمەزرێت، هەر لەگەڵ گەیشـتنی بۆ شـوێنەکە، لە مێـژووی دەسـت بـە کار بوونـی مانگانـە ١١٢٥ مووچـەی بۆ دەبردرێتـەوە، بە گوێـرەی نیزام دەسـتبەکاربوونی خزمەت و دەسـت لەکارکێشـانەوەی لەگـەڵ خەرجـی ڕێگاکەی لێـرە ڕێك دەخرێـت، بە ووتەی ژمێریـاری بەپەلـە ڕاگەیەندراوە.


İ.DH.01438

| | | |
|---|---|---|
| 24 رەجەب 1323 | 01438.000038 | I.DH. |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
٢١٠٠
جەنابی ئەفەندیم
لە ناو ویلایەتی موسڵ قائیمقامیەتی قەزای کۆی سانجەق بە کراوەیی ماوەتەوە، سەبارەت بە دامەزراندنی بەڕێوەبەری پێشووی ناحیەی ئایدنجیك عەبدولستار ئەفەندی لەسەر نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە بڕیارنامە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەرانی مولکیە ڕێکخراوە لەگەڵ کاغەزی وەرگێردراوی زانیاری کەسێتی ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، بە هەر شێوەیەك فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی بفەرمووێت، جێبەجێ دەکرێت، نووسراو کراوە ئەفەندیم، لە ٢٤ ڕەجەب ١٣٢٣ و لە ١١ ئەیلوول ١٣٢١.
سەدری ئەعزەم



| 26 موحەررەم 1323 | 002542.190591 | BEO. |
|---|---|---|

٢٦ موحەررەم ١٣٢٣
٢٠ مارت ١٣٢١
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لە بارەی دامەزراندنی بەڕێوەبەری ناحیەی تەبانلی خەلیل ئەفەندی لە قائیمقامیەتی قەزای کۆی سانجەق، لەسەر نووسراوی دەوڵەت لە مێژووی ٢ زیلحیجە ١٣٢٢ ژمارە ٥٠٨١ بە بریاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە بە ڕەزامەندی ٢٥ موحەررەم ١٣٢٣ فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرموویەتی، هەروەها ئەرکی ناوبراو لە قەزای ناوهاتوو پەنگی خواردۆتەوە و بە گوێرەی ڕێنمایی فەرمانگە کاتێك پسپۆریەکەی بە تاقیکردنەوە پەسەند دەکرێت، نامەی هەڵبژاردنی قائیمقامیەتی پێ دەدرێت، تا نامەی هەڵبژاردنی پێ نەبێت بۆ شوێنێکی تر نەگوازرێتەوە، ئەمەش لە قۆمیسیۆنی ناوهاتوو گفتوگۆی لەسەر کراوە و هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

صدارت عظمی مکتوبی قلمی



| BEO. | 002601.195026 | 13 ڕەبیعی کۆتایی 1323 |
|---|---|---|

١٣ ڕەبیعی کۆتایی ١٣٢٣
٤ حوزەیران ١٣٢١
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لە ناو ویلایەتی موسڵ بڕیاری دامەزراندنی لە قائیمقامیەتی قەزای کۆی سانجەق دەرچووە، بەڵام لەبەر دووری شوێنەکە و پێشووتریش لە کاتی بەدواداچوونی چەتەکاندا قاچی چەپی بریندار بووە، تا ئێستا شوێنەواری ئەو برینداریەی ماوە، بە تەواوەتی چاك نەبۆتەوە، بۆیە لە قەزایەکی نزیکتر دابندرێت، لەسەر داوای خۆی بە واژووی خەلیل سامی داواکاری دراوە لەگەڵ هاوپێچی راپۆرت بۆ دەوڵەت نێردراوە، دەرکەوتووە جەنابی ملوکانە میهرەبانی نیشان داوە، بەم تێروانینە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی کارەکە.

| BEO. | 002653.198914 | 26 جەمادی کۆتایی 1323 |
| --- | --- | --- |
| ٢٦ جەمادی کۆتایی ١٣٢٣<br>١٤ ئۆغستۆس ١٣٢١<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>لە ویلایەتی خوداوەنکار قائیمقامی قەزای کەدوس رەفعەت ئەفەندی بە فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی دوور خراوەتەوە و لە شوێن ئەو قائیمقامی کۆی سانجەق خەلیل سامی ئەفەندی دامەزرێت، نووسراوی دەوڵەت لە مێژووی ٢ تەمموز ١٣٢١ ژمارە ١٨٥٩ بە رەزامەندی فەرمانی پاشای جەنابی پاشا لە مێژووی ١١ ئۆغستۆس ١٣٢١ فەرموویەتی، لەم بارەیەوە وێنەیەکی ئەو بریارنامەیەی لە قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە نێردراوە رەوانی دەوڵەت کراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی. | | |



| BEO. | 002693.201925 | 26 شەعبان 1323 |
|---|---|---|

٢٦ شەعبان ١٣٢٣
١٢ تشرینی یەکەم ١٣٢١
بۆ نەزارەتەکانی ناوەخۆ و دارایی جەلیلە لەگەڵ لایەنی سەر عەسکەریمان
بۆ پاراستنی موسڵ و دەوروبەری لە سەرپێچیەکانی ئێران، لە ژێر قوماندانیەتی میرێکی ئالای، ئەو تابورە نیزامیانەی کە لە رواندز و کۆی سانجەق بوونیان هەیە لەگەڵ ئالای سوارەی موسڵ رێك دەخرێن و ئەو مەفرەزەیە سەربازیە لە ویلایەتەوە کارگێریەکەیان رێك دەخرێت لەسەر راگەیەندراوی سەر عەسکەر فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرموویەتی، لە عالیەوە جێبەجێ دەکرێت، بە نووسراو لە مابەینی هومایۆنی ملوکانەی باش کیتابەتی جەلیلە راگەیەندراوە هەروەها ئاگاداری دراوەتە نەزارەتی دارایی جەلیلە و زانیاری دراوەتە سەر عەسکەری ناوهاتوو، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

ئاگاداری دراوەتە لایەنی سەر عەسکەر و نەزارەتەکانی دارایی و ناوەخۆی جەلیلە بۆ جێبەجێ کردنی.




<table dir="rtl">
<tr><td>BEO.</td><td>002700.202468</td><td>7 ڕەمەزان 1323</td></tr>
<tr><td colspan="3">٧ ڕەمەزان ١٣٢٣<br>٢٢ تشرینی یەکەم ١٣٢١<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>عەبدوڵڵا موخلیس بەگ بە وەکالەت لە قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق بە وەکالەت بۆ قائیمقامی قەزای حەمیدیە گوازراوەتەوە، لەبەر توانا و لێهاتوویی و ئەو کێشەی لە دەستەی سەربازی هەیبووە چارەسەری کردووە هەروەها ئەو خزمەتانەی لە پێشوو کردوویەتی، لەسەر هەندێك ووتە لە پلەوپایەی ویلایەتی موسڵ تەلەگرافنامە هاتووە، بۆ دەوڵەت نێردراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.</td></tr>
</table>




<table>
<tr><td>BEO.</td><td>002704.202768</td><td>27 شەعبان 1323</td></tr>
<tr><td colspan="3">٢٧ شەعبان ١٣٢٣<br>١٣ تشرینی یەکەم ١٣٢١<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>لـە نـاو ویلایەتی موسـڵ، سـەبارەت بە دامەزراندنـی بەڕێوەبەری پێشـووی ناحیەی ئیدنجیك عەبدولسـتار ئەفەندی لە قائیمقامیەتی قەزای کۆی سانجەق، لەسەر نووسراوی دەوڵەت لە ٤ ئۆغستۆس ١٣٢١ ژمارە ٢٤١٣، بە بڕیاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانـی مولکیـە دوای ڕەزامەندی لە ٢٥ شـەعبان ١٣٢٣ بە فەرمانی پاشـای جەنابـی خەلافەتپەناهی فەرموویەتی، وێنـەی بڕیارنامـەی قۆمیسـیۆنی ناوهاتـوو هاوپێـچ بـۆ سـەدارەت نێـردراوە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.</td></tr>
</table>




BEO.002724.204294.002

<table dir="rtl">
<tr><td>BEO.</td><td>002724.204294</td><td>21 شەوال 1323</td></tr>
<tr><td colspan="3">فەرمانگەی گشتی ئەرکانی جەنگی<br>یەکەی چوارەم<br>٢٣٦١<br>راگەیەندراوی بەندەیە<br>چوار تابوری نیزامیە بۆ دەورووبەری سنووری ئێران دەنێردرێت، بۆ شوێنی ئەو چوار تابورەش فرقەی رەدیفی کەرکوك لەگەڵ تابوری کۆی سانجەق و تابوری یەکەمی فرقەی رەدیفی موسڵ و تابوری بەعشیقە پڕ چەك دەکرێن و شوێنی ئەوان دەگرنەوە، بۆ ئەمەش بە فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی ئاگاداری دراوەتە قوماندانیەتی لەشکری شەشەمی هومایۆن، لە بارەی جێبەجێ کردنی ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢١ شەوال ١٣٢٣ و لە ٥ کانوونی یەکەم ١٣٢١.<br>رزا سەر عەسکەر</td></tr>
</table>




موصل ولايتندن وارد اولان شيفره



DH.TMIK.M.00221.00059.001

<table>
<tr><td>DH.TMIK.M.</td><td>00221.00059</td><td>6 رەبیعی یەکەم 1324</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ<br>قەڵەمی نووسین<br>ئەو شیفرەیەیە کە لە ویلایەتی موسڵ هاتووە<br>گوایە بۆ ئەوەی زانیاری لەسەر شوێنەواری کۆن وەربگرن، لە باڵیۆزخانەی ئینگلتەرای دەرسەعادەت بە ئەرك هەفتەیەك پێش ئێستا لە حەلەب بە ڕێگەی دیوریك هاتوونەتە ئێرە، هاوڵاتی ئینگلتەرا بە ناوی سایقس لەگەڵ ژوریقتوبلی لە ڕێگەی عەقرە و زاخۆ دەیانەوێت بچنە دیاربەکر، دوێنی بۆ ئەوەی روو بکەنە کۆی سانجەق، لێرە جولەیان کردووە، مەبەستیان دیاربەکرە بۆیە ڕێگەی نەگونجاو هەڵدەبژێرن، لەو کاتە مەبەستیان بچنە کۆی سانجەق، چونکە دەیانەوێت هەندێك بەدواداچوون بکەن، بۆ ئەوەی جولە و جموجۆڵی ئەوانە چاودێری بکرێن و لە پێش چاوان وون نەبن ئاگاداری پێویست نێردراوە، لە ١٧ نیسان ١٣٢٢.<br>مستەفا والی</td></tr>
</table>






DH.TMIK.M.00229.00045.001

| DH.TMIK.M. | 00229.00045 | 7 ره‌جه‌ب 1324 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
شیفرە لە ویلایەتی موسڵ وەرگیراوە
میری ئاڵا مستەفا بەگ لە دەستەی فەرمانبەرانی لێکۆڵینەوەی سنوور، ماوەی پێنج شەش رۆژە لەگەڵ میری لیوا عەزەت پاشا لە دەستەی ناوهاتوو بەیەکەوە نەخۆش کەوتوون بۆیە لە کۆی سانجەق ماونەتەوە، قائیمقام فوئاد بەگیش زیاد لە خۆی نەخۆشە، لە رانیە گەرێندراوەتەوە کۆی سانجەق، تەنیا نوری بەگ لە دەستە جیانەبۆتەوە، لەسەر ئاماژەی موتەسەرفی کەرکووك سالم پاشا راگەیەندراوە فەرمان.
لە ١٤ ئۆغستۆس ١٣٢٢
مستەفا والی




| 25 رەبیعی یەکەم 1324 | 00364.00057 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لە ٤ مایس ١٣٢٢ موسیو ساقس و ژوریف تولی ئینگلیز بە مەبەستی كۆكردنەوەی زانیاری ناوەخۆ لە كۆی سانجەق چوونەتە رواندز، لەوێشەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ تەیاریەكانی سنووری ویلایەت چاوپێكەوتن بكەن، ویستویانە بچنە قەزای عەمادیە، بۆ ئەوەی رێگە بە رۆیشتنیان نەدرێت، لە رواندزەوە رەوانەی هەولێر بكرێنەوە، لەوێشەوە بێ ئەوەی بچنە موسڵ لە رێگەی قەزاكانی دهۆك و زاخۆ بگەیەندرێنە دیاربەكر، ئەوانەی فەرمانەكە جێبەجێ دەكەن، ئاگاداری پێویستیان پێدراوە، چۆنیەتیشی بە ویلایەتی دیاربەكر راگەیەندراوە.
لە ٦ مایس ١٣٢٢
مستەفا والی موسڵ




DH.ŞFR.00369.00038.001

| 29 جەمادی کۆتایی 1324 | 00369.00038 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

بــۆ ئــەوەی لەگــەڵ فەرمانبەرانــی ئێــران چاوپێکەوتــن ئەنجــام بــدەن، لەگــەڵ دەســتەکەی لــە سەرعەسـکەرەوە چاوەڕێـی وەڵامـی ڕەزامەنـدی دەکـەن، بۆیـە لەگـەڵ دەسـتەکەی بەیەکـەوە گەڕاونەتـەوە کــۆی ســانجەق، لەلایــەن ســالم پاشــا موتەســەرفی کەرکــوك بــە تەلەگــراف ڕایگەیانــدووە فەرمــان.

لە ٧ ئۆغستۆس ١٣٢٢

مستەفا والی




تلغراف نامه



DH.ŞFR.00369.00087.001

| DH.ŞFR. | 00369.00087 | 7 رەجەب 1324 |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>میری ئاڵا مستەفا بەگ لەگەڵ دەستەکەی ماوەی پێنج شەش ڕۆژە وەکو دەستەی لێکۆڵینەوە لەسەر سنوور ئەرکیان پێ سپێردراوە، لەم کاتەدا لەگەڵ میری لیوا عیزەت پاشا نەخۆش کەوتوون، بۆیە لە کۆی سانجەق ماونەتەوە، هەروەها قائیمقام فوئاد بەگیش زۆر نەخۆشە، لە رانیە ڕەوانی کۆی سانجەق کراوەتەوە، تەنیا نوری بەگ لە دەستەکە جیانەبۆتەوە، لەسەر ئاماژەی موتەسەرفی کەرکووك سالم پاشا ڕاگەیەندراوە، لە ١٤ ئۆغستۆس ١٣٢٢.<br>مستەفا والی موسڵ | | |


DH.MKT.01071.00019.001


DH.MKT.01071.00019.002

<table>
<tr><th>DH.MKT.</th><th>01071.00019</th><th>9 سەفەر 1324</th></tr>
<tr><td colspan="3">- فەرمانگەی گشتی ئەرکانی جەنگی<br>یەکەی چوارەم<br>١٦٦<br>راگەیەندراوی بەندەیە<br>لەلایەن فەریقی رەدیف و وەکیلی موتەسەرف موسا کازم پاشا بە ناهەق دەستبەسەرکراوە و سووکایەتی پێ کراوە، بۆیە بە واژووی وەکیلی قائیمقامی پێشووی کۆی سانجەق حەسەن حوسنی لە مەرکەزی کەرکوك تەلەگرافنامە دەرچووە، هاوپێچ پێشکەش کراوە، لەم بارەیەوە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٩ سەفەر ١٣٢٤ و لە ٢١ مارت ١٣٢٢.<br>رزا سەر عەسکەر<br><br>- بۆ جەنابی سپاهیداریمان<br>کۆششی ٤٠ ساڵەم بە هەدەر رۆیشتووە، لە ئەشرافەکانی کەرکووکم، فەریقی رەدیف موسا کازم پاشا وەکیلی موتەسەرف پێچەوانەی دادوەری پاشای تاجدار بە ناهەقی دەستبەسەری کردووم و سوکایەتی جۆراوجۆرم پێ دەکات، داوا دەکەم دادپەروەرانە بن، فەرمان.<br>وەکیلی قائیمقامی پێشوو حەسەن حوسنی</td></tr>
</table>


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
2897 | 217247 | 1


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
2897 | 217247 | 2

BEO.002897.217247.002

| BEO. | 002897.217247 | 5 رەجەب 1324 |
|---|---|---|

- بۆ لایەنی والای سەر عەسکەر
٥ رەجەب ١٣٢٤
١١ ئۆغستۆس ١٣٢٢
لە بارەی گفتوگۆکردنیان لەگەڵ فەرمانبەرانی ئێران، لەسەر ئاماژە پێکردنەکە لە کاتی چاوەڕێ کردنی هاتنی وەڵامی سەرووی سوپاسالار، گەڕاونەتەوە کۆی سانجەق، ئەمەش لەو تەلەگرافنامەیە نیشان دراوە کە لە ویلایەتی موسڵ وەرگیراوە، هەروەها پێویست بە درێژەپێدانی کارەکە ناکات هەرچی زووە چارەسەر بکرێت و رێك بخرێت و چارەسەرێك بدۆزرێتەوە، دەستەی ناوهاتوو بەبێ دواکەوتن لەگەڵ فەرمانبەرانی ئێران گفتوگۆ بکەن و نووسراو بنووسرێتەوە و بە گوێرەی بەرژەوەندی لە سەرۆکایەتی دەستەی ناوهاتوو ئامۆژگاری بەپەلە بدرێت و ئەنجامەکەی رابگەیەندرێت.

- بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
تەلەگرافنامەی بە شیفرە لە ویلایەتی موسڵ هاتووە
لەگەڵ فەرمانبەرانی ئێران گفتوگۆیان کردووە، لە پایەی سەر عەسکەر چاوەڕێی وەڵامی رەزامەندی دەکەن، ئەوانیش لەگەڵ دەستەکە بەیەکەوە گەڕاونەتەوە کۆی سانجەق، لەلایەن سالم پاشا موتەسەرفی کەرکووک بە تەلەگراف راگەیەندراوە، فەرمان، لە ٧ ئۆغستۆس ١٣٢٢.




DH.MKT.01185.00092.001

| 10 جەمادی کۆتایی 1325 | 01185.00092 | DH.MKT. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٤١٦

عەبدولستار ئەفەندی قائیمقامی کۆی سانجەق دایکی مردووە، تا بچێتە بروسە داوای مۆڵەتی سێ مانگی کردووە، لە بارەی وەرگرتنی هاوکاریەکە لە مێژووی ٢٦ شوبات ١٣٢٢ تەلەگرافنامە دەرچووە، بەڵام وەڵامەکەی نەهاتووە، بۆ دووپاتکردنەوەی ئەم بابەتە لەسەر نووسراوەکانی ١١ حوزەیران ١٣٢٣ ویلایەتی موسڵ، سەبارەت بە ئاماژەی پێشوو ئەو نووسراوەی پێشکەش کراوە، دەرکەوتووە مامەڵەی پێوە نەکراوە، لەگەڵ ئەمەش فەرمانبەران هاوکاری ناکرێن بۆ ئەوەی دەست لەکارنەکێشنەوە، ئەگەر بێتو ئەوانەی داوای مۆڵەت دەکەن هۆکارێکی راست و شەرعیان نەبێت، لەلایەن جەنابی پاشاوە دەنێردرێنە شوێنێکی تر و دووردەخرێنەوە لە شوێن ئەوان کەسێکی تر دادەمەزرێنێت، بە تێروانین لە فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی ناوبراو لێی تێگەیشتوون، بۆیە ئەمر و ئاماژەی ویلایەتی ناوهاتوو بە جەنابی نەزارەتپەناهیەوە دەکرێت، لەم بابەتە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٠ جەمادی کۆتایی ١٣٢٥ و لە ٧ تەممووز ١٣٢٣.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
3140 | 235493 | 1

| | | |
|---|---|---|
| 30 رەجەب 1325 | 003140.235493 | BEO. |

٢٦ ئۆغستۆس ١٣٢٣

شیفرە بۆ ویلایەتی موسڵ

دوو کەس بە ناوی ئەمین و محەمەد لە سەرۆك و بازرگانەکانی هۆزی ئاکۆ، لەو کاتەی کە توتن بۆ کۆی سانجەق دەگوازنەوە، لە ڕێگا دەکوژرێن و بە بڕی ١٥٠٠ لیرە کەلوپەل و پارەوپولیان تاڵان دەکەن، بۆ دەستگیرکردنی بوێری کەران، لە ویلاتەوە ئاگاداری هاتووە و بەڵام هیچ ئەنجامێکی نەبووە، بۆیە داوا کراوە بەپەلە بوێری کەران دەستگیر بکرێن و تەمبێ بکرێن، ئەم ماوەیە لە سنوور ئەم جۆرە ڕووداوە نەشیاوانە ڕوو دەدەن و ڕێگە نەدرێت دووبارە بێتەوە.

| 3 رەبیعی یەکەم 1326 | 01233.00079 | DH.MKT. |
|---|---|---|
| - بابی عالی<br>فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ<br>قەڵەمی نووسین<br>ژمارە ۹۳۵<br>قائیمقامی کۆی سانجەق عەبدولستار ئەفەندی لەبەر ئەوەی بە پێچەوانەی رەزامەندی عالی کار دەکات، لەبەر هەندێك کاروکردەوەی نەگونجاو لێکۆڵینەوە دەستی پێکردووە، لێکۆڵینەوەکانیش باش بوون، هەر خۆی بە شێوەیەکی کاتی بردوویانەتە مەرکەزی ویلایەت، ئەگەرچی لە لێکۆڵینەوەکان شتێکی ئاوای لەسەر ساغ نەبۆتەوە، بەڵام ئیتر جێگەی دڵنیایی نییە بگەرێتەوە سەر کارەکەی، بۆیە لەگەڵ قائیمقامی دهۆك ئیبراهیم نەجاتی ئەفەندی ئەرکەکەیان بگۆردرێتەوە، ئەمەش لە ویلایەتی موسڵ تەلەگرافنامە لە مێژووی ۱۷ کانوونی دووەم ۱۳۲۳ نووسراو بە زانیارییەوە نێردراوە، لە کاتی پێداچوونەوەی تۆمارەکەش دەرکەوتووە قەزاکانی ناوهاتوو لەگەڵ ناوبراوان لە چینی سێیەمن، بەم تێروانینە لە بارەی ئاماژەی ویلایەت لەسەر گۆرینەوەیان دەگەرێتەوە بۆ راوبۆچوونی جەنابی نەزارەتپەناهی، لەم بابەتە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>لە ٥ موحەررەم ۱۳۲٦ و ۲٦ کانوونی دووەم ۱۳۲۳<br><br>- ۳ رەبیعی یەکەم ۱۳۲٦<br>۲۲ مارت ۱۳۲٤<br>بۆ ویلایەتی موسڵی عالی<br>هەرچەندە ئاماژە بەوە کراوە کە قائیمقامی دهۆك ئیبراهیم نەجات ئەفەندی لەگەڵ قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق عەبدولستار ئەفەندی گۆرینەوەیان پێ بکرێت، بەڵام دوای رەزامەندی لە وەڵامدا نووسراوی سەدری ئەعزەم لە مێژووی ۱۸ شوبات ۱۳۲۳ هاتووە، عەبدولستار ئەفەندی لە ئەرکەکەی ئێستای کە لە قائیمقامیەتی قەزای کۆی سانجەقە، سەبارەت بە هەڵبژاردنەکەی، لە قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە بریارنامەی لەسەر دراوە، تێدا هاتووە خۆی لە مەکتەبی دواناوەندی دەرچووە، هەڵبژاردننامەشی وەرنەگرتووە، لەبەر ئەوەی لە مەکتەبی مولکیەی شاهانە کەسێك نییە ئارەزووی ئەوە بکات لە قائیمقامیەتی ئەو شوێنە دابمەزرێت، بۆیە تا ناوبراو بە تاقیکردنەوە هەڵبژاردننامەی قائیمقامیەت وەردەگرێت، ئەوا لە شوێن خۆی دەمێنێتەوە و بە بێ تاقیکردنەوە بۆی نییە بۆ هیچ شوێنێکی تر بگوازرێتەوە، لە قائیمقامیەتی قەزای ناوهاتوو ئەرکەکەی پەسەند کراوەتەوە و بۆ ئەم مەبەستەش ئیستعلامنامە نووسراوەتەوە، بریارەکە جێبەجێ بکرێت. | | |



DH.MKT.01267.00066.001

| 17 ڕەمەزان 1326 | 01267.00066 | DH.MKT. |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
قەڵەمی ژمێریاری
ژمارە ١٨٥١/٢٦٤٨
لـە تەلەگرافنامـەی ٢٥ حوزەیـران ١٣٢٤ و هاتنـی کاغـەزی ناوەخـۆ بـۆ قەڵـەم، تۆمـار نەکـراوە، سـەبارەت بـە بینایەکانـی سـەربازی جگـە لـە بینایـەی میـری تـەشرە، مامەڵـەی نۆژەنکـردن و دروسـت کردنـی لـە خەزینـەی جەلیلـە دەرچـووە، فەرمانـی پاشـا فەرموویەتـی تـا جێبەجـێ بکرێـت، لـە تەلەگرافنامـەی باسـکراودا نووسراوەتـەوە بـۆ نۆژەنکردنـەوەی گرتووخانـەی قـەزای کـۆی سـانجەق ٣٠٠٠ قـوروش داواکـراوە، لەگـەڵ مامەڵـەی جێبەجـێ کردنـی تەلەگرافنامـەی ناوهاتـوو هاوپێـچ نـووسراوی نەزارەتـی دارایـی جەلیلـە بـە پێویسـت زانـراوە بەدواداچوونـی بـۆ بکرێـت، نـووسراو بـۆ ویلایەتـی موسـڵ کـراوە و بـۆ ئـەم کارەش نووسراوەکـە بـۆ ژمێریـاری دەگەڕێندرێتـەوە، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ١٤ ئەیلـوول ١٣٢٤.

لە ٣٠ ئەیلوول ١٣٢٤ بۆ دارایی و ویلایەتی موسڵ نووسراوەتەوە.




<table>
<tr><td>DH.MKT.</td><td>02629.00102</td><td>17 ڕەمەزان 1326</td></tr>
<tr><td colspan="3">١٧ ڕەمەزان ١٣٢٦<br>٣٠ ئەیلوول ١٣٢٤<br>بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە<br>هاوپێچی نووسراوی ٢٥ حوزەیران ١٣٢٤ بۆ نەزارەتی عاجیزانە نووسراوەتەوە، سەبارەت بە خەرجی نۆژەنکردنەوەی گرتووخانەی قەزای کۆی سانجەق، فەرمانی خەرج کردنی ٣٠٠٠ قوروش لە ویلایەتی موسڵی بەهیە بە تەلەگرافنامەی ١٠ ئۆغستۆس ١٣٢٤ لەسەر ئاماژەی پێشوو مامەڵەکەی جێبەجێ دەکرێت، بە ووتەی ژمێریاری هاوپێچ بۆ سەروو نێردراوە.</td></tr>
</table>



| 24 موحەررەم 1326 | 003260.244486 | BEO. |
|---|---|---|

بابی عالی
قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە
ژمارە ٣٨٩
نـووسراوی ١٤ موحـەررەم ١٣٢٦ ژمـارە ٤٥٢٨ کـە لـە نەزارەتـی ناوەخـۆی جەلیلـە بـۆ قۆمیسـیۆنی فەرمانبەرانـی مولکیـە نێـردراوە، خوێندنـەوەی بـۆ کـراوە.
لـە بابەتەکـەدا هاتـووە؛ قائیمقامـی کـۆی سـانجەق عەبدولسـتار ئەفەنـدی بەهـۆی ئـەو سـکاڵایانەی لەسـەری تۆمـار کـراوە، لێکۆڵینـەوەی لەسـەر کـراوە، ئەگەرچـی بەرپرسـیارێتیەکەی روون نەبۆتـەوە، بـەڵام گونجـاو نییـە بگەڕێندرێتـەوە شـوێنی ئەرکەکـەی، بۆیـە لەگـەڵ قائیمقامـی قـەزای دهـۆك ئیبراهیـم نەجاتـی گۆڕینەوەیـان پـێ بکرێـت، بـۆ ئەمـەش تەلەگرافنامـە لـە ویلایەتـی موسـڵ وەرگیـراوە و ئامـاژەی پێکـراوە، هەروەهـا هـەردوو ناوبـراو قەزاکانیـان لـە چینـی سـێیەمە، بۆیـە رەزامەنـدی نیشـان دراوە کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت.
عەبدولسـتار ئەفەنـدی کـە لەسـەر قائیمقامیەتـی کۆی سـانجەق هەڵبژێـردراوە، لـە مێـژووی ١٨ رەجـەب ١٣٢٣ ئەو بریارنامەیـەی پێشـکەش کـراوە، راگەیەنـدراوە و بڵاوکراوەتـەوە، خـودی خـۆی لـە مەکتەبـی دواناوەنـدی دەرچـووە و هەڵبژاردننامـەی قائیمقامیەتـی وەرنەگرتـووە، جگـە لەمـە هیـچ نووسراوێکـی هەڵبـژاردن نییـە کـە تێـدا ئامـاژە بە کەسـێکی هەڵبژێـردراو لـە دەرچووانـی مەکتەبـی شاهانەی مولکیـە بـکات کـە ئـارەزووی بـۆ ئـەم کارەی هەبێـت، هەروەهـا دەرچووانـی مەکتەبـی سـوڵتانیە و دواناوەنـدی دەبێ هەشـت سـاڵ خزمەت بکـەن، دواتر قەبـوڵ دەکرێن کـە تاقیکردنـەوە ئەنجام بـدەن تـا پلەیـان بـۆ قائیمقامیـەت بـەرز بێتـەوە، بـە گوێـرەی ئـەو بریـارە تـا ناوبـراو بـە تاقیکردنـەوە هەڵبژاردننامـەی قائیمقامیـەت وەردەگرێـت و تا هەڵبژاردننامەکـە وەردەگرێت لـەوێ لە قائیمقامیەت وەکـو دەستبەسـەر دەمێنێتـەوە، بەبـێ تاقیکردنـەوەش بۆی نییە شـوێنی ئەرکەکـەی بگۆردرێت، بەم شـێوەیە ئەرکی قائیمقامیەتەکـەی پەسـەند کـراوە، بـەم حاڵەتـە ئـەو مامەڵـەی پێویسـتە ئەنجام بدرێـت، بـۆ ئەمـەش نـووسراو بـۆ نەزارەتـی ناوهاتـوو نێـردراوە، لـەم بابەتـەدا ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
لە ٢٤ موحەررەم ١٣٢٦ و ١٤ شوبات ١٣٢٣
ئەندامەکان/سەرۆکی قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە



BEO.003355.251586.002

| 12 جەمادی کۆتایی 1326 | 003355.251586 | BEO. |
|---|---|---|

فەرمانگەی گشتی ئەرکانی جەنگی
یەکەی سێیەم
١٠٧٣
ڕاگەیەندراوی بەندەیە
ساڵی ٣٢١ کانوونی یەکەم تابوری ڕەدیفی موسڵ پڕ چەك کراوە و مۆڵەتی پێدراوە، لە هەمان مێژوودا تابورەکانی کەرکووك و کۆی سانجەق و بەعشیقەش پڕ چەك کراون و ڕەزامەندی وەرگرتنی مۆڵەتیان پێ دراوە، لە کۆتاییدا تابوری ڕەدیفی سلێمانیە پڕ چەك کراوە و لە کەرکووك و چەمچەماڵ بەکار هاتوون و نیشتەجێ کراون، لە سنجاریش تابوری نیزامیە بلۆکێکی بۆ ئاسایشی ناوەخۆ تەواوە و کارەکە بەڕێوەدەبردرێت، سێ بلۆکەکەی تریش بۆ موسڵ دەنێردرێن، لەم حاڵەتەدا مۆڵەتی ئەو چوار تابوری ڕەدیفەی کە باسکراوە لەسەر ئەوە دەمێنێتەوە کە لە دڵنیایی پاراستن و ئەرکی خاڵەکان غەدریان لێ ناکرێت، بە ئاماژەی ویلایەتی موسڵ لە قوماندانیەتی لەشکری شەشەمی هومایۆن تەلەگرافنامە هاتووە و لەسەر نووسینی لەگەڵ وێنەی ئاماژە پێکردنەکە گونجاوە و تەواوە، بۆ ئەمەش جێبەجێ کردنی گۆڕینەوەی شوێنەکانیان بە مۆڵەتدانی تابورەکانی ڕەدیفی کەرکووك و کۆی سانجەق و بەعشیقە و موسڵ بە فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی بووە، بە تەلەگرافنامەش قوماندانیەتی لەشکری ناوهاتوو ئاگادار کراوەتەوە، لەم بابەتە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٢ جەمادی کۆتایی ١٣٢٦ و لە ٢٨ حوزەیران ١٣٢٤.
ڕزا سەر عەسکەر


I.DH. 1478/1327.Z/22

87

İ.DH.01478

| I.DH. | 01478.000087 | 29 زیلقەعدە 1327 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی فەرمانبەران
ژمارە ٣٣١٢
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
راگەیەندراوی بەندەیە

لە ناو ویلایەتی موسڵ، عەبدولستار ئەفەندی قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق، بە مۆڵەت چۆتە دەرسەعادەت، لەگەڵ ئەوەی ماوەی مۆڵەتەکەی تەواو بووە، بەڵام نەگەراوەتەوە سەر کارەکەی، بۆیە دوور بخرێتەوە و لە شوێن ئەو حاجی حەسەن ئەفەندی دابمەزرێت کە بەرێوەبەری تۆماری پێشووی سانجەقی کەرکووك بووە، بە وەکالەت لە قائیمقامیەتی قەزای ناوهاتووش بووە، لەسەر ئاماژەی ویلایەتی ناوهاتوو و بریاری ئەنجوومەنی هەڵبژاردن جێگیر بکرێت، جێبەجێ کردنی بە هاوکاری سەدارەتەوە دەبێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، ٢٩ زیلقەعدە ١٣٢٧ و ٢٩ تشرینی دووەم ١٣٢٥.
راوێژکار بە ناوی نازری ناوەخۆ




| DH.MKT. | 02748.00093 | 2 سەفەر 1327 |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ<br>بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە<br>بۆ جەنابی ئەفەندم<br>قائیمقامی کۆی سانجەق عەبدولستار ئەفەندی بە مەبەستی وەرگرتنی مۆڵەت، لە دەرسەعادەت داوای مۆڵەتی کردووە، بە تێروانین لە ئەنجامدانی پشکنینی پزیشکی دەرکەوتووە پێویستی بە تیمارکردنە، لە وەڵامی نەزارەتی مولکیەی کاروباری پزیشکی نووسراو وەرگیراوە، لە نووسراوەکە نیشان دراوە کە ماوەی مۆڵەتەکەی بۆ دوو مانگی تر درێژ بۆتەوە، لەم بارەیەوە فەرمان فەرمانی جەنابی ئەفەندیمە، لە ٢ سەفەر ١٣٢٧ و لە ١٠ شوبات ١٣٢٤.<br>راوێژکار بە ناوی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە | | |



| 1327 21 رەبیعی کۆتایی | 02809.00022 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢١ رەبیعی کۆتایی ١٣٢٧
٢٨ نیسان ١٣٢٥
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
مێژووی ٤ مارت ١٣٢٣ ژمارە ٢ وەڵامی نووسراوی ویلایەتە، لە بارەی ئاماژە کردن بە فەرمانبەرانی ناسنامەی قەزاکانی کۆی سانجەق و هەولێر، دامەزراندنی مەحمود ئەفەندی و ساڵح ئەفەندی، کاغەزی وەرگێردراوی زانیاری کەسێتی ساڵح ئەفەندی نێردراوە بۆ ئەوەی لە یەکەی تۆمار، تۆمار بکرێت، هەروەها ناوبراوان لەگەڵ مێژووی دەست بە کار بوونیان مانگانە هەر یەکە ٢٥٠ قوروش مووچەیان بۆ دابین دەکرێت، لە بارەی دەست بەکاربوون و وەستاندنی کارەکە ببەسترێنەوە بە بریاری نیزامیە و کەفالەتەوە، بە گوێرەی رێنماییەکان مامەڵەکە جێبەجێ بکرێت، هەروەها لەگەڵ دەست بە کاربوونیان مێژووی دەست لە کار هەڵگرتنیان بە ووتەی ژمێریاری رادەگەیەندرێت.



DH.MKT.02817.00059.001



<table>
<tr><td>DH.MKT.</td><td>02817.00059</td><td>25 زیلحیجه 1314</td></tr>
<tr><td colspan="3">- ٦ مایس ١٣٢٥<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>لە بارەی ناردنی مووچەی کەڵەکەبووی قائیمقامی کۆی سانجەق عەبدولستار ئەفەندی بەپەلە وەڵامی تەلەگرافی ٩ نیسان ١٣٢٥ بنێردرێت.<br><br>- بۆ ویلایەتی موسڵ<br>عەبدولستار قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق مووچەی کەڵەکەبووی لە وەزارەتی ناوەخۆ بنێردرێت، تەلەگرافی ٩ نیسان ١٣٢٥ دووپاتکردنەوەی نووسراوە.</td></tr>
</table>



<table>
<tr><th>DH.MKT.</th><th>02880.00049</th><th>1 رەجەب 1327</th></tr>
<tr><td colspan="3">١ رەجەب ١٣٢٧<br>٦ تەمموز ١٣٣٢<br>بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە<br>هـۆزی شـێخ بزێنـی کـە لـە نـاو قـەزای کـۆی سـانجەقن، هەندێکیـان بـە نـاوی ڕەشـید ئاغـا و تۆفیـق ئاغـا و شـەریف ئاغـا و ئەسـعەد ئاغـا و فـارس ئاغـا لەگـەڵ هاوەڵانیـان لـە نـاو قـەزا خەڵکیـان کوشـتوە و پارەوپـول و کەلوپەلیـان تـاڵان کـردووە، لـە بـارەی ئـەم جـۆرە زوڵـم و دەسـتدرێژیانەی کـە کردوویانـە، یاسـایان پێشـێل کـردووە و داواکـراوە ئاسایشـی ناوچەکـە دووبـارە بەرقـەرار بکرێتـەوە، لـە شـوێن خـۆی جۆرەهـا واژوو نێردراوەتـە سـەرۆکایەتی ئەنجوومەنـی نێردراوانـی جەلیلـە، داواکاری بـە هاوپێچـەوە نێـردرا، بـە تێروانیـن لـە نووسراوەکانـدا دەبـێ بـە پەلـە لێکۆڵینـەوە و بەدواداچـوون ئەنجـام بدرێـت و ناوبـراوان دەسـتگیر بکرێـن، بـە گوێـرەی یاسـا مامەڵـەکان جێبەجـێ بکرێـن، کە بدرێنـە لایەنـی داد و ئەنجامەکە ڕابگەیەندرێـت، نووسراوەکانیش بگەڕێندرێنەوە.</td></tr>
</table>



DH.MKT.02901.00062.001



<table>
<tr><th>DH.MKT.</th><th>02901.00062</th><th>28 رەجەب 1327</th></tr>
<tr><td colspan="3">- بۆ موسڵ<br>قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق عەبدولستار ئەفەندی بە مۆڵەت لە دەرسەعادەتە، مووچەی کەڵەکەبووی بۆ وەزارەتی ناوەخۆ نێردراوە، لە تەلەگرافنامەی ٩ نیسان ١٣٢٥،٦ مایس ١٣٢٥ دووپات کراوەتەوە، کەچی هێشتا وەڵامەکەی نەهاتووە.<br><br>تەلەگرافنامەی دووپاتکراوە<br><br>- ٢ ئۆغستۆس ١٣٢٥<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>لە بارەی مووچەی کۆکراوەی قائیمقامی کۆی سانجەق عەبدولستار ئەفەندی، هیواداریین بەپەلە وەڵامی تەلەگرافی ٦ مایس ١٣٢٥ بنێردرێت.</td></tr>
</table>



| 28 رەجەب 1327 | 02901.00086 | DH.MKT. |
| --- | --- | --- |

٢ ئۆغستۆس ١٣٢٥
بۆ ویلایەتی موسڵ
قائیمقامی کۆی سانجەق ئەمین ئەفەندی لە ژیان نەماوە، مووچەی کۆکراوەی هەیە، لە نووسراوەکانی مێژووی ١٧ ئۆغستۆس ١٣٢٠ ویلایەت راگەیەندراوە، کە ئەمجارە بە پێویست زانراوە ٩١٦٣ قوروش لە دەفتەری نارێکخراوی قەرز تۆمار بکرێت، بە ووتەی ژمێریاری راگەیەندراوە.

دائرهٔ صدارت تحریرات قلمی

شعبه ۱

OSMANLI ARŞİVİ

BEO

3677 | 275747

| | | |
|---|---|---|
| 1327 زیلحیجه 3 | 003677.275747 | BEO. |

٣ زیلحیجە ١٣٢٧

٣ کانوونی یەکەم ١٣٢٥

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی عالی

بـە ئامـاژەی ویلایـەت، حاجـی حەسـەن ئەفەنـدی کـە بەڕێوەبـەری تۆمـاری پێشـووی سـانجەقی کەرکـووك بـووە، بـە مەبەسـتی دامەزراندنـی لـە وەکالەتـی قائیمقامیەتـی کـۆی سـانجەق سـەر بـە ویلایەتـی موسـڵ، نـووسراوی سـەروو لـە ٢٩ تشرینـی دووەم ١٣٢٥ ژمـارە ٣٣١٢ بـە ڕەزامەنـدی ١ کانوونـی یەکـەم ١٣٢٥ فەرمانـی پاشـای جەنابـی خەلافەتپەناهـی فەرموویەتـی، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.

دائرۀ صدارت تحریرات قلمی

شعبه ۲

| لاجل التبییض قلمه ورودی | | | | | مبیضی | مسودی | اوراق نومروسی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | داخلیه نظارت علیه سنه | | | ۲۰۵۶۸ |
| مقابله ایدنلر | | | | | تاریخ تبییض | تاریخ تسوید | قلمه ورودی تاریخی |
| | | ۸ | ۸ | | ۹ | | ۸ ذی الحجه ۳۲۷<br>۸ کانون اول ۳۲۵ |

سیواس ولایتی داخلنده دیوریکی قضاسی قائممقاملغنه کوی سنجاق قائممقاملغندن اولوب مأذوناً دیاربکرده بولنان عبدالستار افندینک تعیینی خصوصنه ۳ کانون اول ۳۲۵ تاریخلی و ۳۳۴۸ نومرولو تذکرۀ علیه لری اوزرینه بالاستیذان ۷ کانون اول ۳۲۵ تاریخلی اراده سنیه حضرت خلافتپناهی شرفصدور بیورلمش اولمغله ایفای مقتضاسنه همت



| 8 زیلحیجە 1327 | 003680.275943 | BEO. |
|---|---|---|
| ٨ زیلحیجە ١٣٢٧<br>٨ کانوونی یەکەم ١٣٢٥<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی عالی<br>قائیمقامی کۆی سانجەق عەبدولستار ئەفەندی کە بە مۆڵەت لە دەرسەعادەتە، لە قائیمقامیەتی قەزای دیوریکی سەر بە ویلایەتی سیواس دامەزرێت، لە هەمان کاتدا بە مەبەستی گواستنەوە و دامەزراندنی ناوبراو، نووسراوی عالی ٣ کانوونی یەکەم ١٣٢٥ ژمارە ٣٣٤٨، بە ڕەزامەندی ٧ کانوونی یەکەم ١٣٢٥ فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرموویەتی، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی. | | |

| DH.MTV. | 00043.00007 | 22 ڕەمەزان 1328 |
|---|---|---|

بۆ جەنابی قائیمقام

لە شارۆچکەی کۆی سانجەق لە ساڵی ٣٢٦ مانگی ئەیلوول شەوی ١١ بازاڕەکەی مەیدانی خوارەوە ئاگری گرتووە و ٢٠ دوکان سووتاوە و کەلوپەل و ئەمانەتی ناوی سووتاوە ئەمەش دەفتەری ناوەکانیانە.

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| حاجی مەعروف زادە مەلا مەحمود 145 لیرەی عوسمانی | ئەحمەد کوڕی مزین 150 لیرەی عوسمانی | حاجی ئەمین سورن محەمەد گەلی 90 لیرەی عوسمانی | حاجی تاهیر حاجی ئەحمەد 120 لیرەی عوسمانی | نەجیب مام سلێمان ئاغا 45 لیرەی عوسمانی |
| قادر کوڕی کەریم 75 لیرەی عوسمانی | قادر چاوشین 25 لیرەی عوسمانی | کەریم پیرداود ئاغا 12 لیرەی عوسمانی | محەمەد حەبیب وەستا عەبدولرەحمان 12 لیرەی عوسمانی | سەید عەبدوڵڵا موحسین 30 لیرەی عوسمانی |
| عەبدوڵڵا عوسمان 10 لیرەی عوسمانی | قادر سەعید حەمە عەجەم 5 لیرەی عوسمانی | ئەمین مستەفا ... 15 لیرەی عوسمانی | ئیسماعیل رەسول کیشکە 5 لیرەی عوسمانی | سابر ئیبراهیم ئاغا 20 لیرەی عوسمانی |
| کەریم ماموکە 15 لیرەی عوسمانی | حاجی سەعید حاجی ئەحمەد 10 لیرەی عوسمانی | فەقێ شەریف 30 لیرەی عوسمانی | حەمید سەلیم رەشید ئەفەندی 20 لیرەی عوسمانی | عەلی مام 20 لیرەی عوسمانی |
| سالح خدر ئەبابکر 15 لیرەی عوسمانی | فەتحوڵڵا ئەمین جارجیس 10 لیرەی عوسمانی | محەمەد ئەمین ئاغا 5 لیرەی عوسمانی | وەستا ئیبراهیم خەنجەرچی 10 لیرەی عوسمانی | عەبدوڵڵا ئیسماعیل کۆرە 15 لیرەی عوسمانی |
| محەمەد مزین 10 لیرەی عوسمانی | سدیق وەستا عەبدوڵڵا بەربەر 10 لیرەی عوسمانی | ئەوەی پێویستە بۆ خەرج کردنی 20 دوکانە سوتاوەکان 110 لیرەی عوسمانی | | |

ئەمرۆ بە لیرەی عوسمانی دەکاتە ١٠٤٢

لە شارۆچکەی کۆی سانجەق ساڵی ٣٢٦ مانگی ئەیلوول شەوی ١١ بازاڕەکەی مەیدانی خوارەوە، بە قەدەری خوا ٢٠ دوکان ئاگری گرتووە و ئەوەی لە ناو دوکانەکاندا بووە لە کەلوپەلی بازرگانی و دەفتەری قەرزەکان لە یەك کاتدا هەر هەمووی بە پارەوپولەوەش سووتاوە و دوای لێکۆڵینەوە دەرکەوتووە ١٠٤٢ لیرە زەرەروزیانی بەرکەوتووە، لەم کاتەدا هەموو کاروکاسبی وەستاوە و هەموو لایەك پێویستیان بە پارەیە، بۆیە جەنابی پاشا میهرەبانی نیشان بدات، لە فەرمانگەی عالی لە بارەیانەوە مامەڵەی پێویست جێبەجێ بکرێت، زانیاری یەك مانگ لە رۆژنامە رێکخراوە و راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بارەیەوە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٤ ئەیلوول ١٣٢٦.

بریکاری سەرۆکی شارەوانی کۆی سانجەق

٥٠

حضور سامی حضرت قائمقامی اکرمیه

کویسنجق قصبه سنک اوچیوز یگرمی التی سنه سی شهر ایلولک اون بشنجی کیجه سنده یوقارو میدانده احمد اولاده یدیلی دکانلر ایچنده
اموال وامانه ودفاتر اصحابنک علی الاساس بروجه زیر دفتریدر

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| حمه معروف زاده ملا محمود غروش عثمانی ١٤٥ | احمد بدیزیه غروش عثمانی ١٥٠ | حاجی احمد [illegible] غروش عثمانی ٩٠ | حسن طاهر حاجی احمد غروش عثمانی ١٢٠ | نجیب [illegible] آغا غروش عثمانی ٤٥ | |
| قادر [illegible] کریم غروش عثمانی ٧٥ | قادر چاوشیه غروش عثمانی ٢٥ | کریم [illegible] داود آغا غروش عثمانی ١٥ | محمد حسین [illegible] غروش عثمانی ١٢ | سید عبدالله شیخ محمد غروش عثمانی ٢٠ | عبد آغا غروش عثمانی ١٠ |
| قادر سعید [illegible] غروش عثمانی ٥ | احمد مصطفی بابیه غروش عثمانی ١٥ | احمد سعید [illegible] غروش عثمانی ٥ | حاجی ابراهیم آغا غروش عثمانی ٢٠ | کریم [illegible] غروش عثمانی ١٥ | حاجی سعید حاجی احمد غروش عثمانی ١٠ |
| فقه شریف غروش عثمانی ٢٠ | حمه سلیم [illegible] غروش عثمانی ٢٠ | علی [illegible] غروش عثمانی ٢٠ | صالح حقی ابابکر غروش عثمانی ١٥ | فتح الله احمد [illegible] غروش عثمانی ١٠ | محمد امین آغا غروش عثمانی ٥ |
| اوسته ابراهیم خنجرچی غروش عثمانی ١٠ | عبدالله [illegible] غروش عثمانی ١٥ | محمد بدیزیه غروش عثمانی ١٠ | محمد اوسته عبدالله بدر غروش عثمانی ١٠ | احمد اولاده یدی دکانه نقد موجود غروش عثمانی ١١٠ | |

یکون
غروش عثمانی
١٠٤٢

کویسنجق قصبه سنک اوچیوز یگرمی التی سنه سی شهر ایلولک اون بشنجی کیجه سنده یوقارو میدان [illegible] موقعنده بولنان
دکانلره [illegible] دکانلر ایچنده بولنان اموال تجاریه ودیونات دفاترینک [illegible]
[illegible]
[illegible]
[illegible]
[illegible]
کویسنجق بلدیه رئیسی وکیلی





DH.MTV.00043.00007.003


دائرهٔ صدارت تحریرات قلمی



| BEO. | 003804.285231 | 8 رەمەزان 1328 |
| --- | --- | --- |

٨ رەمەزان ١٣٢٨
٣١ ئۆغستۆس ١٣٢٦
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
بـۆ جێبەجـێ کردنـی کارەکان ئەفسـەرەکانی رەدیفـی لەشـکری شەشـەمی هومایۆن، ئاغـای قـول عـەواد سـەبری ئەفەنـدی لـە تابـوری یەکەمـی کـۆی سـانجەق سـەر بـە ئـاڵای ٩٠ مانگانـە بـە ١٢٨٦ و یوزباشـی محەمـەد ئەفەنـدی لـە بلۆکـی ١٥ی تابـووری چوارەمـی مەرگـە سـەر بـە ئـاڵای رەدیفـی ٩١ مانگانـە ٩٥٠ و لـە تابـوری ناوهاتـووی بلۆکی ١٥ مولازمـی یەکـەم عەبدولرەحـمان ئاغـا بـە ٦٩١ و مولازمـی دووەمـی بلۆکـی دەیـەم عەلـی ئەفەنـدی لـە تابـوری سـێیەمی قەرەداغـی سـەر بـە ئـاڵای رەدیفـی ٩٢ مانگانـە بـە ٦٣٧ قـوروش مووچـەی مانگانـە خانەنشـین دەکرێـن، ناوبـراوان عـەواد سـەبری ئەفەنـدی مووچەکـەی لـە دارایـی کـۆی سـانجەق و عەبدولرەحـمان ئاغـا مووچەکـەی لـە دارایـی کەرکـوک و ئەوانـی تریـش مووچەکەیـان لـە دارایـی سـلێمانیە وەردەگـرن، لـەم بارەیـەوە لەسـەر راپۆرتـی نەزارەتـی جەنگـی جەلیلـە لـە مێـژووی ٢٣ ئۆغسـتۆس ١٣٢٦ ژمـارە ١٢٨٥ بـە رەزامەنـدی مێـژووی ٢٩ ئۆغسـتۆس ١٣٢٦ فەرمانـی پاشـای جەنابـی خەلافەتپەناهـی فەرموویەتـی، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.


دائرۀ صدارت تحریرات قلمی

OSMANLI ARŞİVİ

BEO

3968 | 297534

| BEO. | 003968.297534 | 1 زیلحیجه 1329 |
|---|---|---|

١ زیلحیجه ١٣٢٩
٩ تشرینی دووەم ١٣٢٧
بۆ نەزارەتی جەنگی جەلیلە
مولازمی یەکەم محەمەد عەلی ئەفەندی لە تابوری یەکەمی کۆی سانجەقی بلۆکی سێیەم سەر بە لەشکری شەشەمی رەدیفی پێشەوای ئاڵای ٩٠، ناوەکەی لە مولازمی یەکەم بۆ یوزباشی راست کراوەتەوە، هەروەها لەبەر ئەوەی محەمەد عەلی ئەفەندی شوێنەکەی بەجێ دەهێڵێت، مولازمی یەکەم عەلی ئەفەندی لە یوزباشی بلۆکی یەکەمی تابوری ناوهاتوودا دامەزرێت، نووسراو لە ٣ تشرینی دووەم ١٣٢٧ ژمارە ٦٢٨ ڕێکخراوە و نێردراوە، لە عالیش پەسەند کراوە، وێنەی پەسەند کراوی بریارنامەکە هاوپێچ بۆ دەوڵەت نێردراوە، جێبەجێ بکرێت.





DH.MB.HPS.00036.00019.003

| DH.MB.HPS. | 00036.00019 | 17 جەمادی یەکەم 1330 |
| --- | --- | --- |

نەزارەتی دارایی
بەڕێوەبەرایەتی مولکی میری
٢٣٠٤ قەڵەمی یەکەم
ژمارە
٦٣٠٣ گشتی
١٥٠ تایبەتی
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
پوختە: لە بارەی نووسراوی دروست کردنی گرتووخانەی کۆی سانجەق.

دووبارە بە پێویست زانراوە لە کۆی سانجەق گرتووخانەیەك دروست بکرێت، بۆ خەرجی دروست کردنەکەی، ٨٦٧٠ قوروش دانراوە، بۆ ڕەزامەندی وەرگرتن لەسەر خەرج کردنی ئەو برە پارەیە بە ئاماژەی موتەسەرفیەتی کەرکووك، لە ویلایەتی موسڵ نووسراو لە مێژووی ٧ کانوونی یەکەم ١٣٢٧ ژمارە ١٩٧ بە ئاگادار کردنەوە نێردراوە، تا ساڵی ١٣٢٨ دەبێ جێبەجێ بکرێت، لە یەکەم فەرماندا نووسراوی جەلیلەی ٥ مارت ١٣٢٧ ژمارە ٣/٣٥٧٩١، جێ بەجێ دەکرێت بۆ ڕاگەیاندنی و ئەنجامەکەی ووردبینی بۆ کاغەزە نێردراوەکان کراوە، ئەنجامی ووردبینیەکەی لە دەستەی هونەری ڕاپۆرت دراوە لەگەڵ وێنەی پەسەندکراوی هاوپێچ پێشکەشی نەزارەتپەناهی کراوە، بە ڕاگەیاندنی ڕێزوسڵاو ئەفەندم، لە ١٧ جەمادی یەکەم ١٣٣٠ و لە ٢٤ کانوونی دووەم ١٣٢٧.
بەڕێوەبەرایەتی مولك بە ناوی نازری دارایی



DH.MB.HPS.00087.00012.002

| DH.MB.HPS. | 00087.00012 | 17 شەعبان 1330 |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ١٢٧
سـەبارەت بـە وەرگرتنـی ڕەزامەنـدی خـەرج کـردن و خـەرج نەکردنـی خەرجـی ڕێـگای گواسـتنەوەی مسـتەفا ئاغـای گاردیان.
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
جەنابی ئەفەندیم
ئـەو فەرمانبەرانـەی کـە لە شـوێنێك بۆ شـوێنێکی تـر دەگوازرێنەوە ئەگەر پێویسـت بکات خەرجی ڕێگایـان بۆ خەرج بکرێـت، لـە ڕووی خزمەتـەوە کارەکـە ئەنجـام بدرێـت، لـە راسـتیدا هیـچ فەرمانێـك نـەدراوە لـە سـەر خـەرج کردنی خەرجـی ڕێـگای ئەوانـەی ئـەرك جێبەجـێ دەکـەن، یەکێـک لـە گاردیانەکانـی گرتووخانـەی کەرکووك مسـتەفا ئاغا بۆ گاردیانـی گرتووخانـەی کـۆی سـانجەق گوازراوەتـەوە، نـووسراو نێـردراوە تـا بزانرێـت خەرجـی ڕێگاکەی بـۆ جێبەجێ دەکرێـت یـا جێبەجـێ ناکرێت، لە سـەردانی ناوهاتوو و لەسـەر ئاماژەی موتەسـەرفیەتی کەرکـووك رادەگەیەندرێت، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ١٧ شـەعبان ١٣٣٠ و لـە ١٨ تەممـوز ١٣٢٨.
تاهیر والی موسڵ

TELEGRAMME تلغرافنامه

دولت علیهٔ عثمانیه تلغراف اداره‌سی

ADMINISTRATION DES TELEGRAPHES DE L'EMPIRE OTTOMAN



DH.İD.00145.2.00007.002

| DH.ID. | 00145.2.00007 | 19 شەوال 1330 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆ

لە موسڵ تا کەرکووك دوو هێڵی تەلەگراف بوونی هەیە، یەکێکیان تایبەتە بە پەیوەندی بەغداد و دیاربەکر کە تەلی راستەقینەیە، هەرچی تەلەکەی ترە ئەوا ویلایەتی موسڵ لەگەڵ لەشکری قولی لیواکانی کەرکووك و سلێمانیە هەروەها لە نێوان قەزاکانی هەولێر و رواندز و کۆی سانجەق و مەعمورەی حەمیدیە بەکار دەهێندرێت، کە تەلەگرافەکانی ناتوانن هەواڵی سنوور بگوازنەوە، بۆیە هەواڵە گرنگەکان چەندین رۆژ دوا دەکەوێت، هەولێر و کەرکووك ٢٠ کاتژمێر دووری نێوانیانە، بۆیە زیادکردنی تێلی سێیەم زۆر پێویستە، لەم کاتەدا نۆژەنکردنەوەی هێڵەکان دەست پێ دەکات، لەگەڵ خەرجی ئەو نۆژەنکردنەوانە تێلی سێیەمیش زیاد بکرێت، بەمەش هۆکاری دواکەوتنی هەواڵە گرنگەکانی سەر سنوور چارەسەر دەبێت، بۆ بەرژەوەندی هەموو لایەك تکا دەکرێت.

لە ١٨ ئەیلوول ١٣٢٨

تاهیر والی

| BEO. | 004079.305883 | 20 ڕەمەزان 1330 |
|---|---|---|

٢٠ ڕەمەزان ١٣٣٠
٢٠ ئۆغستۆس ١٣٢٨
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
سەید ئەحمەد ئەفەندی فەرمانبەری کارگێری کۆی سانجەق بەهۆی مامەڵەی نەشیاوی سکاڵای لەسەر تۆمار کراوە، بە واژووی محەمەد میرزا و هاوەڵی لە هۆزی یەراجی لە مەرکەزی کۆی سانجەق داواکاری گۆرینی ناوبراو بە تەلەگرافنامە دەرچووە، وێنەی ئەو تەلەگرافنامەیە بە هاوپێچ نێردراوەتە والا، بەهۆی ئەو سکاڵایانەوە بەپەلە لێکۆڵینەوەی پێویست ئەنجام بدرێت، لەسەر ئەم بارودۆخەی ناوبراو لێکۆڵینەوە لەسەر سکاڵاکان کراوە، بریار دراوە بگۆردرێت و لە شوێن ئەو کەسێك دابنرێت کە کارەکە بە ڕێکوپێکی ڕاپەرێنێت، بۆ ئەم کارەش سەرەتا ئاگاداری دراوەتە شوێنی ناوبراو، هیممەت بکرێت بە هەموو شێوەیەك ڕێگەی لێ بگیرێت.




DH.SN.THR.00044.00004.002

| 26 رەجەب 1331 | 00044.00004 | DH.SN.THR. |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی دەرەوە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی کاروباری شەهبەندەر و بازرگانی و یاسای جۆراوجۆر
یەکەی کاروباری شەهبەندەر
ژمارە ٣٩٩-٣٤٢١٠
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
جەنابی ئەفەندم

لە کەرکووک، رواندز، کۆی سانجەق، هەولێر، سلێمانیە و موسڵ لەگەڵ زۆر شوێنی تر هاووڵاتی عوسمانی بە بێ پاسەپۆرت دێنە ساوچبۆلاق، لەم حاڵەتەدا بۆ دڵنیابوون لە هاووڵاتی بوونی ئەوانە لەگەڵ فەرمانبەرانی ناوەخۆ تووشی کێشە و ناکۆکی دەبنەوە، لەم بارودۆخەدا خەزینەش زیانێکی زۆری پێ دەگات، دوای ئەوەش پێویستە هاووڵاتیانی ناوهاتوو ناچار بکرێن پاسەپۆرت دەربهێنن، بۆ ئەمەش نووسراو لە شەهبەندەری ساوچبۆلاق بۆ باڵیۆزی تاران نووسراوە، ئەو نووسراوانەی بۆ نەزارەت ڕۆیشتووە وێنەیەکی هاوپێچ نێردراوە، ئەگەرچی هاووڵاتیانی عوسمانی ئەوانەی دەیانەوێت بچنە ووڵاتی بێگانە ناچار کراون پاسەپۆرت هەڵبگرن، بە گوێرەی یاسای پاسەپۆرت تایبەت بە ماددەی ئەو بابەتە سوودی هەیە، پێویستە هاووڵاتیانی عوسمانی پاسەپۆرتیان هەبێت، ئەگەر لەو ڕێگایە تووشی مەترسیش ببنەوە بە ڕێگای ویلایەتەکانی ئێرانەوە ئاگاداری بدرێتە لایەنی عوسمانی، بۆ ئەمەش نووسراو کراوە ئەفەندم.
لە ٢٦ رەجەب ١٣٣١ و لە ١٨ حوزەیران ١٣٢٩




DH.İD.00145.2.00043.002

| | | |
|---|---|---|
| DH.ID. | 00145.2.00043 | 14 رەمەزان 1331 |

نەزارەتی پۆستە و تەلەگراف و تەلەفۆن
قەڵەمی تایبەتی
ژمارە
٢٧٠٤ تایبەتی
١٤٣٦٨ گشتی
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
جەنابی ئەفەندیم

٢٨ ی تەممـوز لـە هێڵـی تەلەگرافـی کـۆی سـانجەق پچـران روویـداوە، لـە دوو شـوێنی دەورووبـەری هەولێریش ٣٠ مەتـر دزراوە، هەروەهـا شەشـەکەی تریـش تێکـدراوە، بـە گوێـرەی ئـەو ئاماژەیـەی کـە لـە شـوێن خۆیـدا هاتـووە، دەرکەوتـووە لەگـەڵ دەسـتگیرکردنی بوێـری کـەران تەمبـێ دەکرێـن و فەرمانـی رێگەگرتـن لـە دەسـتدرێژی کردنـە سـەر ئـەو هێڵـە دەرچـووە، ئـاگاداری کاریگـەر دراوەتـە ویلایـەت تـکا کـراوە تـا جێبەجـێ بکرێـت، لـەم بارەیـەوە ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ١٤ رەمـەزان ١٣٣١ و لـە ٤ ئۆغسـتۆس ١٣٢٩.
نازری پۆستە و تەلەگراف و تەلەفۆن




٣٤



DH.MB.HPS.00148.00020.001

| DH.MB.HPS. | 00148.00020 | 5 جەمادی کۆتایی 1331 |
|---|---|---|
| ویلایەتی موسڵ<br>قەڵەمی نووسین<br>ژمارە ٣٤<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>پێشکەش کردنی خشتەی ئامادەبووی گرتووخانەی کۆی سانجەق.<br>جەنابی ئەفەندم<br>پاشکۆی داواکاری ١٤ نیسان ١٣٢٩ ژمارە ٢٥، ئەوەی پەیوەستە بە گرتووخانەی کۆی سانجەق ئامادەیە، ئەو خشتەیەی لە موتەسەرفیەتی کەرکووك نێردراوە بە هاوپێچ پێشکەش کرا، لەم بارەیەوە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٥ جەمادی کۆتایی ١٣٣١ و لە ٢٩ نیسان ١٣٢٩.<br>والی موسڵ | | |

| 29 موحەررەم 1331 | 01497.000041 | I.DH. |
|---|---|---|

- بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران
٦٩٠٢ گشتی
٣٠٩٠ تایبەتی
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
راگەیەندراوی بەندەیە

لە ناو ویلایەتی موسڵ، قائیمقامی قەزای هەولێر ئیبراهیم بەگ، لەبەر گرنگی لایەنی کارگێری قەزاکە دەرکەوتووە ناتوانێت کارگێری قەزاکە بەڕێوە ببات، لەبەر ئەوەی لە رووی کارگێریەوە قەزای کۆی سانجەق بە ئاسانی بەڕێوە دەبردرێت، قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق حەسەن ئەفەندی لەگەڵ ناوبراو گۆڕینەوەی شوێنەکەیان پێ بکرێت، لەسەر ئاماژەی ویلایەتی ناوهاتوو و ئەو بڕیارەی لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران دراوە، جێگیر کردن و لیستی فەرمانی پاشا هاوپێچ پێشکەش کراوە، بە هاوکاری سەدری ئەعزەم کارەکە جێبەجێ دەکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٢٩ موحەررەم ١٣٣١ و لە ٢٦ کانوونی یەکەم ١٣٢٨
نازری ناوەخۆ

- بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی قەڵەمی فەرمانبەران
ژمارە ٢٥٣٧
فەرمانی پاشا
قائیمقامەکانی قەزاکانی هەولێر و کۆی سانجەق ئیبراهیم بەگ لەگەڵ حەسەن ئەفەندی گۆڕینەوەیان جێبەجێ کراوە.

بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا فەرمانبەری نەزارەتی ناوەخۆ ئەرکەکەی پێ سپێردراوە، لە ٣ سەفەر ١٣٣١ و لە ٣٠ کانوونی یەکەم ١٣٢٨.

نازری ناوەخۆ
سەدری ئەعزەم



| | | |
|---|---|---|
| 4 سەفەر 1331 | 004133.309955 | BEO. |

٤ سەفەر ١٣٣١
٣١ کانوونی یەکەم
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
سەبارەت بە گۆڕینەوەی قائیمقامەکانی هەولێر و کۆی سانجەق، ئیبراهیم بەگ لەگەڵ حەسەن بەگ ئەفەندی، نووسراوی ٢٦ کانوونی یەکەم ١٣٢٨ ژمارە ٣٠٩٠ لەگەڵ لیستی فەرمانی پاشا کە بە واژووی هومایۆنی جەنابی پاشا پەسەند کراوە، وێنەی پەسەندکراوی هاوپێچ بۆ سەروو نێردراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

DH.İD.00177.00017.002

| DH.ID. | 00177.00017 | 16 ڕەجەب 1332 |
| --- | --- | --- |

تەلەگرافنامە
لە کەرکووك دەرچووە
بۆ سەدارەتی پایەبەرز
باوکم شێخ عەبدولغەفور ئەفەندی لە کۆی سانجەق خانەیەکی یەك دەرگا لەگەڵ کۆشکەکەی بۆ منداڵەکانی کردۆتە وەقف، بەڵام لە نەزارەتی بەغداد و لە کەرکووك تۆمار کراوە و دەستی بەسەرداگیراوە، بەستراوەتەوە بە شەرعەوە، ئەمەش ناهەق و زوڵمە چونکە دەیانەوێت بیروخێنن و مەکتەبی لەسەر دروست بکەن، لێرە نەمتوانیوە هاوار و هیمدادم بگەیەنمە کەسێك، بە ناوی شەریعەت دەمەوێ قەدەغە بکرێت و تکا دەکەم رادەستی ئێمە بکرێتەوە.
نوری پۆست نشین

TELEGRAMME تلغرافنامه

دولت علیهٔ عثمانیه تلغراف اداره‌سی

ADMINISTRATION DES TELEGRAPHES DE L'EMPIRE OTTOMAN

L'état n'accepte aucune responsabilité à raison du service de la télégraphie

DH.ŞFR.00428.00004.001

| 1 ڕەجەب 1332 | 00428.00004 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆ
قـازی پێشـووی کـۆی سـانجەق لەگـەڵ دوو کـەس لـە دانیشـتوان بەهـۆی خراپەکاریەکانیـان بدرێنـە دادگا، کاغـەزی لێکۆڵینەوەیـان هـەر ئێسـتا لـە موتەسـەرفیەتی کەرکـووك دەربهێنرێـت بەپەلـە لـە دادگا دادگایـی بکرێـن، چونکـە هێشـتا لـە خراپـەکاری بەردەوامـن، بـە پەلـە فەرمانـی تونـد بدرێتـە ناوەخـۆ.
لە ١٣ مایس ١٣٣٠
حلمی سەرپەرشتیاری مولکیە

DH.ŞFR.00428.00009.001

| | | |
|---|---|---|
| **DH.ŞFR.** | 00428.00009 | **1 رەجەب 1332** |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆ

یوسف بەگ بەرێوەبەری شەقڵاوەی سەر بە کۆی سانجەق لەبەر تاوانەکانی دوورخراوەتەوە، لەگەڵ دوورخستنەوەکەی خانەنشین بکرێت.

١٣ مایس ١٣٣٠

حلمی سەرپەرشتیاری مولکیە

DH.ŞFR.00428.00034.001

DH.ŞFR.00428.00034.001

| | | |
|---|---|---|
| DH.ŞFR. | 00428.00034 | 4 ڕەجەب 1332 |

لە موسڵ دەرچووە

بۆ ئەوەی ئاگاداری بدرێتە نەزارەتی جەلیلە، تەلەگرافنامەی بە شیفرە لە سەرپەرشتیاری مولکیەی ویلایەت وەرگیراوە، رادەگەیەندرێت.

ئەحمەد وەکیلی والی موسڵ

وێنە

حەمە ئاغای کۆی سانجەق ٣٠٠ و هەندێك قەرزاری دارایيە، ئەو قەرزەی کە لە ڕەژی هەیەتی، هەرچی زووە وەربگیرێت،فەرمان.

DH.ŞFR.00429.00071.001

| DH.ŞFR. | 00429.00071 | 14 ڕەجەب 1332 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆ

لە ٢١ نیسان ١٣٣٠ بە نووسراو ڕاگەیەندراوە كە لەبەر هەندێك هۆكار بە پێویست زانراوە قائیمقامی كۆی سانجەق ئیبراهیم ئەدهەم ئەفەندی گۆرینەوەی شوێنی پێ بكرێت، بەڵام لەبەر هەندێك بارودۆخی ناوەخۆ قائیمقامی گولعەنبەر محەمەد عەلی ئەفەندی كۆتایی بە ئەركەكەی هێنراوە، بۆیە بۆ قائیمقامیەتی گولعەنبەر بگوازرێتەوە، ڕاوبۆچوون و چەسپاندنی بۆ نەزارەتپەناهیە.

لە ٢٦ مایس ١٣٣٠

سلێمان نەزیف والی




İ.TAL.00490.00059.002

| I.TAL. | 00490.00059 | 28 رەبیعی کۆتایی 1332 |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
قەڵەمی تایبەت
٢٠٤٢
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهیم
ڕاگەیەندراوی بەندەیە

لە زاناکانی قەزای کۆی سانجەق کوڕی خوالێخۆشبوو عەبدوڵڵا ئەفەندی، کە بە بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری خەریك بووە و بە گشتی لەبەر چاکەکاریەکانی جێگای ڕێزە، محەمەد ئەفەندی لە پلەی سێیەم بە نیشانی مەجیدی نیشانی عالی ڕێزی لێگیراوە، بۆ ئەمەش لە ویلایەتی موسڵ نووسراو هاتووە، بۆ ئەم بابەتەش لیستی فەرمانی پاشا بەیەکەوە پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی بە هاوکاری فەخامەت دەبێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٨ رەبیعی کۆتایی ١٣٣٢ لە ١١ شوبات ١٣٢٩.
نازری ناوەخۆ


عدد
٩٦٦

İ.DH 1508/1332.B/31

2

İ.DH.01508

| I.DH. | 01508.000078 | 22 رەجەب 1332 |
| --- | --- | --- |
| بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>بەڕێوەبەرایەتی فەرمانبەران<br>ژمارە ٩٦٦<br>فەرمانی پاشا<br>بە دوورخستنەوەی محەمەد عەلی بەگ قائیمقامی گولعەنبەر، لە شوێن ئەو بە مووچەی چینی دووەم قائیمقامی کۆی سانجەق ئیبراهیم ئەدهەم ئەفەندی، هەروەها بۆ قائیمقامیەتی ساور، قائیمقامی پێشووی ئۆلۆنیە حوسێن نەسیمی بەگ گوازراونەتەوە و دامەزراون.<br><br>بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا نازری ناوەخۆ ئەرکی پێ سپێردراوە، لە ٢٢ رەجەب ١٣٣٢ و لە ٤ حوزەیران ١٣٣٠.<br>وەکیلی نازری ناوەخۆ<br>سەدری ئەعزەم | | |


i.DH 1509/1332.L/21
106

2

İ.DH.01509

| 1332 شەوال 23 | 01509.000106 | I.DH. |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی فەرمانبەران
ژمارە ۱۷۱۰
فەرمانی پاشا
بـۆ قائیمقامیەتـی قارەمـان، بـە مووچەی چینـی دووەم عەلی عوسـمان قائیمقامی کۆی سـانجەق و بۆ قائیمقامیەتی کۆی سـانجەق بە مووچەی چینی یەکەم حلمی ئەفەندی لە تۆماری مەعمورەی عەزیزە و بۆ قائیمقامیەتی حارم، لە قائیمقامیەتی کلیس رەفعەت و بۆ قائیمقامیەتی کلیسیش بە مووچەی چینی یەکەم لە نەزارەتی ناوەخۆی کاروباری خۆچێـی، بەڕێوەبـەری قەڵەمـی ویلایـەت، سـەرۆکی یاریـدەدەر فوئـاد شـەهاب بـەگ گوازراونەتـەوە و دامـەزراون.

بـۆ جێبەجـێ کردنـی فەرمانی پاشـا نـازری ناوەخۆ ئەرکی پێ سـپێردراوە، لـە ۲۳ شـەوال ۱۳۳۲ و لە ۱ ئەیلـوول ۱۳۳۰.
نازری ناوەخۆ
سەدری ئەعزەم

| BEO. | 004292.321900 | 24 رەجەب 1332 |
| --- | --- | --- |

٢٤ رەجەب ١٣٣٢
٥ حوزەیران ١٣٣٠
بۆ وەکالەتی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
قائیمقامی گولعەنبەر محەمەد عەلی بەگ دوورخراوەتەوە بۆ شوێنی ئەو بە مووچەی چینی دووەم قائیمقامی کۆی سانجەق ئیبراهیم ئەدهەم ئەفەندی، بۆ قائیمقامیەتی ساوری قائیمقامی پێشووی ئۆلوینە حوسێن نەسیمی بەگ بگوازرێنەوە و دابمەزرێن، بە رەزامەندی فەرمانی پاشای جەنابی پاشا فەرموویەتی وێنەی پەسەند کراوی هاوپێچ بۆ سەروو نێردراوە، لە جێبەجێ کردندایە.

٤ حوزەیران ١٣٣٠ لەسەر فەرمانی پاشا.


دائرهٔ صدارت امور مهمه قلمی

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
4305 | 322806

| 20 رەمەزان 1332 | 004305.322806 | BEO. |
|---|---|---|

٢٠ رەمەزان ١٣٣٢
٣٠ تەمموز ١٣٣٠
نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

لە وەڵامی نووسراوی ٢٦ تەمموز ١٣٣٠ ژمارە ٩٥١، بۆ قائیمقامیەتی قەزای بەیکوز، حلمی بەگ موفەتیشی مولکیەی پێشوو هەروەها بۆ قائیمقامیەتی کۆی سانجەق بە مووچەی چینی دووەم عەلی عوسمان ئەفەندی قائیمقامی قەزای بالوە و بۆ قائیمقامیەتی دهۆك بە مووچەی چینی دووەم ئەرتوغرول شوکر کە لە قائیمقامیەتی .... دوور خراوەتەوە، بەهۆی دوورخستنەوەی ئەحمەد بەگ لە قائیمقامی غەزە، موعین بەگ کە بە مووچەی چینی ناوهاتوو لە قائیمقامیەتی شەران لێبووردراوە دامەزرێن، سەبارەت بەو دامەزراندنە بە رەزامەندی فەرمانی پاشای جەنابی پاشا فەرموویەتی، وێنەی پەسەند کراوی هاوپێچ بۆ عالی نێردراوە ئەفەندم.

٢٨ تەمموز ١٣٣٠ ١٥٢١ لەسەر فەرمانی پاشا.

دائرهٔ صدارت امور مهمه قلمی

| BEO. | 004310.323227 | 24 شەوال 1332 |
|---|---|---|

٢٤ شەوال ١٣٣٢
٢ ئەیلوول ١٣٣٠
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
وەڵامی نووسراوی ٣٠ ئۆغستۆس ١٣٣٠ ژمارەی تایبەتی ١٠٦٦:
بــۆ قائیمقامیەتــی قەرەمــان بــە مووچــەی چینــی دووەم، قائیمقامــی کــۆی ســانجەق عەلــی عوســمان و بــۆ قائیمقامیەتــی کــۆی ســانجەق بــە مووچــەی چینــی یەکــەم حلمــی ئەفەنــدی کــە لــە تۆمــاری مەعمــورەی عەزیــزە دوور خراوەتــەوە، هەروەهــا بــۆ قائیمقامیەتــی حــارم قائیمقامــی کلیــس رەفعــەت و بــۆ قائیمقامیەتــی کلیســیش بــە مووچــەی چینــی یەکــەم فوئــاد شــەهاب بەڕێوەبــەری یاریــدەدەری دووەم لــە کاروبــاری ناوەخــۆ قەڵەمــی ویلایــەت بگوازرێنــەوە و دامەزرێــن، بــۆ ئــەم مەبەســتە بــە ڕەزامەنــدی فەرمــان پاشــای جەنابــی پاشــا فەرموویەتــی، وێنــەی پەســەند کــراوی هاوپێــچ بــۆ لایەنــی دەوڵــەت نێــردراوە ئەفەنــدم.

١ ئەیلوول ١٣٣٠ لەسەر فەرمانی پاشا.

DH.İ.UM.EK.00006.00079.001

| DH.I.UM.EK. | 00006.00079 | 17 رەبیعی کۆتایی 1333 |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>لە ٩ی شوبات تا ١٥ لە کۆپری ٨٢٥٩ قیە گەنم و ٥٢ قات جێگەی نووستن کە پەیوەستە بە کەرکووکەوە لە کۆی سانجەقیش ٨ تەنکە قاورمە، لە بەغدادیش ٢٧٩٢٣ قیە جۆ رەوانی سامەڕا کراوە، لە ١٧ شوبات ١٣٣٠.<br>والی رەشید | | |


DH.MB.HPS.00114.00038.005


DH.MB.HPS.00114.00038.005

| DH.MB.HPS. | 00114.00038 | 10 شەوال 1333 |
|---|---|---|

- ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ١١٦ تایبەتی
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
جەنابی نازر بەگ
گرتووخانەی کۆی سانجەق وێران بووە، بۆ نۆژەنکردنەوەی هاوپێچ دەرخستەی یەکەم و راپۆرت پێشکەش کراوە، بۆ ئەوەی بەپەلە بڕی تێچووەکەی بگەڕێتەوە، پێویستمان بە هاوکاریە، لەسەر ئاماژەی موتەسەرفی کەرکووك و ووتەی ژمێریاری ویلایەت راگەیەندراوە، لەم بابەتە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٨ شەعبان ١٣٣٣ و لە ٢٨ حوزەیران ١٣٣١.
دەفتەردار بە ناوی وەکیلی والی موسڵ

- بەڕێوەبەرایەتی کارگێری گرتووخانەکان
وێنەی دەرخستە و کاغەزەکانی گرتووخانەی کۆی سانجەق دوای ووردبینی لە هەژمارەکەی هەڵەی تێدا کراوە و بڕی پارەکە زیاتر نووسراوەتەوە، بۆیە ٣٨ قوروش کەم کراوەتەوە و لە ئەنجام دەرخستەکە دەکاتە ١٦٧٣٠ قوروش راست کراوەتەوە، بەمەش یەکسان بینراوە، لە ٨ ئۆغستۆس ١٣٣١.

OSMANLI ARŞİVİ
DH.UMVM
133 8 1

DH.UMVM.00133.00008.001

| 4 زیلقەعدە 1333 | 00133.00008 | DH.UMVM. |
|---|---|---|
| ٣١ ئۆغستۆس ١٣٣١<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆ<br>بۆ نۆژەنکردنەوەی مەکتەبی سەرەتایی کۆی سانجەق لەلایەن خەڵکەوە ٢٦٠ قوروش بەخشراوە، بۆ ئەوەی نۆژەکردنەوەکە بە ڕێگای خۆی جێبەجێ بکرێت، لە بەرامبەر وەرگرتنی برە پارەی ناوهاتوو لە موازەنەی ئەم ساڵە لە بەشی سێیەم ئەو برە پارەیە دابینکراوە ڕێك بخرێت و بۆ ڕاگەیاندنی هاوکاری داواکراوە، بە بریاری ئەنجوومەن ڕاگەیەندراوە.<br>بە ناوی والی | | |

OSMANLI ARŞİVİ
DH.UMVM
138 | 26 | 3

DH.UMVM.00138.00026.003

<table>
<tr><th>DH.UMVM.</th><th>00138.00026</th><th>28 جەمادی یەکەم 1333</th></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>لە موسڵ دەرچووە<br>هاوپێچی مێژووی ٢ کانوونی دووەم ١٣٣٢، بۆ مەکتەبی کۆی سانجەق ١٠٠٠٠ قوروش کۆکراوەتەوە، بەرامبەر بە دابینکردنی داهات پەلە بکرێت لە جێبەجێ کردنی، لە ٣١ مارت.<br>شەریف وەکیلی والی</td></tr>
</table>

DH.İ.UM.EK.00020.00051.002

| DH.I.UM.EK. | 00020.00051 | 19 زیلقەعدە 1334 |
| --- | --- | --- |
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆ<br>ئەو پارەیەی کە لە قائیمقامیەتی کۆی سانجەق بۆ نەخۆشخانەی هەولێر کۆکراوەتەوە، لەوێ بۆ سەربازی بێ هێز نەخۆشخانەیەکی ١٠٠ قەرەوێلەی دروست کراوە.<br>٤ ئەیلوول ١٣٣٢<br>حەیدەر والی موسڵ | | |

| DH.MB.HPS.M. | 00025.00014 | 9 رەجەب 1334 |
|---|---|---|

- ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی نووسین
ژمارە٦٢ تایبەتی
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
بۆ جەنابی نازر بەگی ئەفەندم
هاوپێچی نووسراوەکانی ١٨ نیسان ١٣٣٢ ژمارە ٤٣ لە گرتووخانەی کەرکووک ساڵی ٣٣١ ی سێیەم جار و گرتووخانەی کۆی سانجەق لە دووەم و سێیەم جار هەژماری خشتەی چوار مانگ هاوپێچ پێشکەش کراوە، لەم بابەتە ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٩ رەجەب ١٣٣٤ و ٢٨ نیسان ١٣٣٢
حەیدەر والی موسڵ

- لە سانجەقی کەرکووک سەر بە ویلایەتی موسڵ خشتەی هەژماری چوار مانگی گرتووخانەیە
ژمارەی سزادراوان

لە ساڵی ٣٣١ سەرەتای مانگی تشرینی دووەم تا کۆتایی مانگی شوبات لە ماوەی چوار مانگدا لەسەر ئەوەی نیشان دراوە ٢٤٣ کەس لە گرتووخانەی لیوای کەرکووک دادگایی کراون، هەروەها ئەوانەی دەستبەسەرن دیاریکراوە، بۆ هەژماری ئەم کارە خشتە ڕێکخراوە و پێشکەش کراوە.

| جۆری تاوان | نێر | مێ | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|
| تاوانی کوشتن | 87 | نییە | 87 |
| ئاژاوە | 24 | 2 | 26 |
| تۆمەتبار | 102 | نییە | 102 |
| کاری بەد | نییە | نییە | نییە |
| دەبێتە | 214 | 1 | 215 |

لە کۆتایی شوبات ١٣٣١
بە مۆری عەبدوڵڵا کوڕی عوسمان، کاتب/ فەرمانبەری گرتووخانەی لیوای کەرکووک

- لە ویلایەتی موسڵ سانجەقی کەرکووک خشتەی هەژماری چوار مانگی گرتووخانەی قەزای کۆی سانجەقە
ژمارەی سزادراوان

لە ساڵی ٣٣١ مانگی تشرینی دووەمی یەکەم ڕۆژ تا کۆتایی شوباتی هەمان ساڵ، ئەو مانگانەی کە نێردراوە، لە ماوەی چوار مانگدا لە گرتووخانەی قەزا ئەوانەی لە کاری ئاژاوە و بەد دادگایی کراون ٩ کەسن و لە کاری تاوانیش ٣٦ کەس لە ڕەگەزی نێر دەستبەسەرن، خشتەی گرتووخانەش ڕێکخراوە و پێشکەش کراوە، کۆتایی شوبات ١٣٣١.

| جۆری تاوان | نێر | مێ | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|
| تاوانی کوشتن | نییە | نییە | نییە |
| ئاژاوە | 9 | نییە | 9 |
| کاری بەد | نییە | نییە | نییە |
| دەبێتە | 9 | | 9 |

ژمارەی دەستبەسەران

| جۆری تاوان | نێر | مێ | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|
| تاوان | 36 | نییە | 36 |
| ئاژاوە | نییە | نییە | نییە |
| کاری بەد | نییە | نییە | نییە |
| دەبێتە | 36 | نییە | 36 |

گاردیانی گرتووخانە/ قوماندانی ژاندارمە/
قائیمقامی کۆی سانجەق

- خشتەی گۆڕینی فەرمانبەرانی گرتووخانەی کۆی سانجەق

| ناوی فەرمانبەران | مێژووی دامەزراندنی | دەستبەکاربوونی | مێژووی دەستلەکارکێشانەوەی | ناو | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|
| مەعروف ئاغا | 1 تەمموز 1331 | 1 تەمموز 1331 | 22 حوزەیران 1331 | رەشید ئاغا | لەبەر مردنی دەستی لە کێشاوەتەوە |

لە کۆتایی شوبات ١٣٣١
قوماندانی ژاندارمە/ قائیمقامی کۆی سانجەق

- لە ویلایەتی موسڵ سانجەقی کەرکووك خشتەی هەژماری چوار مانگی گرتووخانەی قەزای کۆی سانجەقە
ژمارەی سزادراوان

| جۆری تاوان | نێر | مێ | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|
| تاوانی کوشتن | نییە | نییە | نییە |
| ئاژاوە | 7 | نییە | 7 |
| کاری بەد | نییە | نییە | نییە |
| دەبێتە | 7 | نییە | 7 |

ژمارەی دەستبەسەران

| جۆری تاوان | نێر | مێ | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|
| تاوان | 21 | نییە | 21 |
| ئاژاوە | نییە | نییە | نییە |
| کاری بەد | نییە | نییە | نییە |
| دەبێتە | 21 | نییە | 21 |

لە ساڵی ٣٣١ مانگی تەمموزی رۆژی یەکەم تا کۆتایی تشرینی یەکەمی هەمان ساڵ لە مانگەکان لە ماوەی چوار مانگدا لە گرتووخانەی کۆی سانجەق ٧ کەس بە کاری ئاژاوە و بەد دادگایی کراون، ٢١ کەسیش لە رەگەزی نێر بە هۆی تاوانەوە دەستبەسەرن، بۆ ئەم کارە دووەم هەژماری خشتە رێکخراوە و پێشکەش کراوە، لە کۆتایی تشرینی یەکەم ١٣٣١.

گاردیانی گرتووخانە/ قوماندانی ژاندارمە/ قائیمقامی کۆی سانجەق


I.DUİT. 00129

| I.DUIT. | 00129.000021 | 28 رەجەب 1334 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەرێوەبەرایەتی ویلایەت بۆ کاروباری ناوەخۆ
گشتی ٣١٦٦
تایبەت ٢٥٨
بۆ جەنابی سەدری ئەعززەم لە سەدارەتپەناهی
راگەیەندراوی بەندەمانە

لە ناو ویلایەتی موسڵ بۆ تەواوکردنی مەکتەبێکی سەرەتایی لە قەزای کۆی سانجەق لەلایەن دانیشتوانی ..... پارە کۆکراوەتەوە، لە بەرامبەر ١٠٠٠٠ قوروش جێبەجێ کراوە، لە موازەنەی تایبەتی ساڵی ٣٣٢ی ویلایەت خەرجی دروست کردنی مەکتەبی سەرەتایی رێکخراوە، لە ویلایەتی موسڵ ئاماژەی پێکراوە کە دابینکردنی ئەو برە پارە بەرزە تەنیا بە بریار دەبێت، لەم بارەیەوە لیستی فەرمانی پاشا رێکخراوە هاوپێچ راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
٢٨ رەجەب ١٣٣٤ و ١٨ مایس ١٣٣٢
نازری ناوەخۆ




DH.UMVM.00138.00065.001

| DH.UMVM. | 00138.00065 | 22 ڕەجەب 1334 |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆ<br>لە ٢٧ نیسان ١٣٣٢ بۆ دروست كردنی مەكتەبی كۆی سانجەق لە بودجەی ئەم ساڵەدا تۆمار كراوە، ١٠٠٠٠ قوروش بۆ دروست كردنی مەكتەبی ناوهاتوو خەرج دەكرێت، بۆ خەرج كردنی برە پارەی ناوهاتوو بە ڕێكخستنی داهاتەوە هاوكار بن بۆ خەرج كردنی.<br>بە ناوی والی موسڵ | | |


حربیه نظارتی
امور محاکم
مدیریتی
٥٥٤
اراده سنیه

DUIT 170/101

| I.DUIT. | 00170.000101 | 5 ڕەجەب 1334 |
| --- | --- | --- |

نەزارەتی جەنگی
بەڕێوەبەرایەتی کاروباری دادگاکان
٥٥٤
فەرمانی پاشا

لە دانیشتووانی قەزای کۆی سانجەق، سەعید کوڕی ئەحمەد لەگەڵ هاوەڵانی لە کاتی گەڕانەوەیان لە ڕێگا هاتوونەتە بەرامبەریان و مامەڵەی توندوتیژ و زۆرەملیان ئەنجام داوە و کەلوپەلەکەیان بردووە و تاڵان کردووە، بۆیە هەر یەکە بە سێ ساڵ و نیو بە سزای سەوڵ لێدان سزا دراون، لەلایەن جەنابی پاشاش سزاکەیان پەسەند کراوە، لە قەزای ناوهاتوو گوندی شیلە، ڕەشید کوڕی کوخە کەریم و حەمەی برادەری لەگەڵ عەبدولباقی کوڕی ئیبراهیم، دەرکەوتووە ئەندامی سەربازین، هەر یەکە بە سێ ساڵ و نیو بە سزای سەوڵ لێدان سزا دراون، لە یاسانامەی سزای سەربازی، پشت بەستن بە ماددەی ٤٦ هەروەها لە مێژووی دەستگیرکردنیانەوە هەر یەکە بە ماوەی ١٤ مانگ، بگوازرێنەوە بۆ زیندانی پەرانفە، لەوانە ڕەشید لە ئەندامە نوێیەکان نەبووە، ماوەی سزاکەی لە ماوەی وەرگرتنی ئەرکی سەربازیەکەیەوە هەژمار بکرێت ئەوانی تریش بۆیان هەژمار نەکرێت، لە دیوانی جەنگی عورفی موسڵ بریار دراوە و پەسەندیش کراوە.
بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا نازری جەنگی ئەرکی پێ سپێردراوە، لە ٥ ڕەجەب ١٣٣٤ و لە ٢٥ نیسان ١٣٣٢.

وەکیلی نازری جەنگی/ سەدری ئەعزەم




DH.İ.UM.EK.00023.00074.001

| DH.I.UM.EK. | 00023.00074 | 12 موحەررەم 1335 |
|---|---|---|
| هاوپێچ ٣ تشرینی یەکەم ١٣٣٢، ساڵی ٣٣١ لە قەزای کەرکووك ٢٠٩١ و لە قەزای هەولێر ٢٣٥٩، لە رانیە ١٣٠٠، لە سەلاحیە ١٠٧٨، سەر مەڕ خراوەتە ژێر دەست، لە قەزای رواندز بە کۆمەڵ دەفتەرەکانی سوتاوە، ناتوانرێت هەژمارەکەی بنێردرێت، لە قەزای کۆی سانجەقیش هێشتا وەڵام وەرنەگیراوە، لە قەزای سنجاریش سەر مەڕەکان نەکەوتوونەتە ژێر دەست.<br>واحید والی | | |

DH.MB.HPS.M.00026.00018.001

| 19 موحەررەم 1335 | 00026.00018 | DH.MB.HPS.M. |
|---|---|---|
| هاوپێچ نووسراوی ٢٨ حوزەیران ١٣٣٢ (١١٨)، بۆ نۆژەنکردنەوەی گرتووخانەی کۆی سانجەق بەپەلە حەواڵە نامە بنێردرێت و فەرمانی خەرجیەکە بە تەلەگراف ڕەوان بکرێت.<br>حەیدەر والی | | |




دولت عثمانیه
پوسته و تلغراف و تلفون نظارتی



| DH.I.UM.EK. | 00026.00092 | 26 رەبیعی یەکەم 1335 |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆ<br>لە موسڵ دەرچووە<br>هاوپێچی ٢٤ تشرینی یەکەم ١٣٣٢، ساڵی ٣٣١ لە لیوای سلێمانیە ٢٨٤ و لە قەزای کۆی سانجەقیش ١٤٤٥ سەر مەڕ خراوەتە ژێر دەست.<br>شەریف بە ناوی والی موسڵ | | |


اراده سنیه

باب عالی
داخلیه نظارتی

خصوصی ۱۵۸

DUIT 45/42

İ.DUİT.00045

| I.DUIT. | 00045.000042 | 3 جەمادی کهۆتایی 1335 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی تۆماری زانیاری و فەرمانبەران
١٥٨ تایبەتی
فەرمانی پاشا
بـۆ قائیمقامیەتـی قـەزای کـۆی سـانجەق قائیمقامـی حـەران، نەسـیب بـەگ هەروەهـا بـۆ قائیمقامیەتـی قـەزای قەلـب قائیمقامـی سـەروچ، جەلالەددیـن بـەگ بـە مووچـەی دیاریکـراوی خۆیـان گوازراونەتـەوە.

بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا فەرمانبەری نازری ناوەخۆ ئەرکی پێ سپێردراوە، لە ٣ جەمادی کۆتایی ١٣٣٥ لە ٢٦ مارت ١٣٣٣.

سەدری ئەعزەم و نازری ناوەخۆ

مجلس وكلا

مذاكراتنه مخصوص ضبط نامه

خلاصهٔ مآل

قراری

MV. 209/67

| MV. | 00209.000067 | 19 زیلحیجە 1335 |
| --- | --- | --- |

١٩ زیلحیجە ١٣٣٥
٧ تشرینی یەكەم ١٣٣٣
ئەنجوومەنی بریكارەكان
بریارنامە لەسەر نووسراوەكانی تایبەت
پوختەی دارایی

لە نێوان هێزی تەمبێ كردن و چەتەكان رووبەرووبوونەوە روویداوە، لە بازرگانەكانی توتن، مستەفا ئاغا خەڵكی كۆی سانجەق لە گوندی هرمك پێنج خانە لەگەڵ ١٩٠٠ قیە تووتنی سووتاوە، هەروەها بژێوی ژیانی خێزانەكەی لەسەر توتنی باسكراوە، بۆیە داوای میهرەبانی حكوومەت دەكات، بە گوێرەی راپۆرتی ئەنجوومەنی كارگێری ناوەخۆ بری توتنی سوتاو ٧١٢٥ قوروش دەكات، راگەیەندراوی رێكخستنی كارەكە دراوەتە ویلایەتی موسڵ، لەسەر ئەو ئاماژەیە برەكەی لە خەزینە پەسەند كراوە، لەبەر ئەوە برە پارەی دیاریكراو لە بوودجەی دارایی ئەم ساڵە، لە خەرجی چاوەروواننەكراو رێكخراوە، بۆ وەرگرتنیشی بە مۆڵەتی نەزارەتی دارایی لە مێژووی ٣ تشرینی یەكەم ١٣٣٣ ژمارە ٢٧٦ نووسراوی تایبەت بەم بابەتە خوێندنەوەی بۆ كرا.

بریار

لەسەر ئاماژەی جێبەجێ كردنی، لە وەڵامدا نووسراو بۆ نەزارەتی ناوهاتوو كرا.

| | | |
|---|---|---|
| BEO. | 004461.334546 | 4 جەمادی کۆتایی 1335 |

٤ جەمادی کۆتایی ١٣٣٥
٢٧ مارت ١٣٣٣
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
وەڵامی نووسراوی ٢٥ مارت ١٣٣٣ ژمارەی تایبەتی ٧١:
بۆ قائیمقامیەتی قەزای کۆی سانجەق، نەسیب بەگ قائیمقامی حەران هەروەها بۆ قائیمقامیەتی قەزای قەلب، جەلالەددین بەگ قائیمقامی سەروج بگوازرێنەوە، بۆ ئەم مەبەستە ڕەزامەندی فەرمانی پاشای جەنابی پاشا فەرموویەتی وێنەی پەسەندکراوی هاوپێچ بۆ دەوڵەت نێردراوە.

٢٦ مارت ١٣٣٣ لەسەر فەرمانی پاشا.




| 1335 زیلقەعدە 8 | 004482.336101 | BEO. |
|---|---|---|

٨ زیلقەعدە ١٣٣٥
٢٧ ئۆغستۆس ١٣٣٣
بۆ نەزارەتی دادی جەلیلە
وەڵامی نووسراوی ٢٥ ئۆغستۆس ١٣٣٣ ژمارە ٩٤:
بۆ قازیەتی قەزای کۆی سانجەق، قازی قەزای خوراسان مستەفا جەلالەددین ئەفەندی دادەمەزرێت، هەروەها لە بارەی ڕێنمایی هەندێك لە فەرمانبەرانی داد، لەسەر ئاماژەی دەوڵەت بە ڕەزامەندی فەرمانی پاشای جەنابی پاشا فەرمویەتی وێنەی پەسەندکراوی هاوپێچ بۆ لایەنی عالی نێردراوە ئەفەندم.

٢٦ ئۆغستۆس ١٣٣٣ لەسەر فەرمانی پاشا.




BEO.004486.336448.002

| BEO. | 004486.336448 | 23 زيلحيجه 1335 |
| --- | --- | --- |
| نەزارەتی دارایی<br>بەڕێوەبەرایەتی دارایی ژمێریاری<br>قەڵەمی خەرجی گشتی دارایی<br>٢٧٦٤ گشتی<br>٣٦ تایبەتی<br>بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی<br>ڕاگەیەندراوی بەندەمانە<br>لە نێوان چەتەکان و هێزی تەمبێ کردن ڕووبەڕووبوونەوە ڕوویداوە، لەم کاتەدا لە گوندی هرمك پێنج خانە لەگەڵ ١٩٠٠ قیە تووتنی بازرگانی کۆی سانجەق مستەفا ئاغا سووتاوە، هەروەها بژێوی ژیانی ٢٠ کەس لە ئەندامانی خێزانەکەی لەسەر ئەو تووتنەیە، بۆیە لە ئەنجوومەنی کارگێری لیوا تووتنە سووتێنراوەکە دیاری کراوە و ٧١٢٥ قوروشی بۆ دابین کراوە، ئەمەش لە نووسراوی ویلایەتی موسڵ هاتووە تێدا دیاری کراوە، جگە لەمەش لە خەزینە لەسەر بری ئاماژە پێکراوەکە ڕازی بوونە، ئەوەی باسکراوە لە ٧١٢٥ قوروش لە بوودجەی نەزارەتی عاجیزانە ئەم ساڵە لە خەرجی چاوەڕواننەکراو ڕێك دەخرێت و وەریدەگرێت، جێبەجێ کردنی بە بڕیاری ئەنجوومەنی بریکارەکان فەرمان دراوەتە لایەنی عاجیزانەم، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>٢٧ ئۆغستۆس ١٣٣٣/٣ تشرینی یەکەم ١٣٣٣<br>نازری دارایی | | |




<table>
<tr><td>I.DUIT.</td><td>00046.000073</td><td>2 جەمادی یەکەم 1336</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>بەڕێوەبەرایەتی تۆماری زانیاری و فەرمانبەران<br>٢٣٨ تایبەتی<br>فەرمانی پاشا<br>بۆ قائیمقامیەتی ساسۆن، قائیمقامی گولعەنبەر سوڵتان ئەفەندی و بۆ قائیمقامیەتی کۆی سانجەق، قائیمقامی رواندز نەشئەت بەگ کارەکان وەردەگرن، لەگەڵ مووچەکانیان دەگوازرێنەوە، هەروەها بۆ قائیمقامیەتی رواندزیش بە مووچەی چینی دووەم قائیمقامی پێشوو زاخۆ مەسعود بەگ دامەزراوە.<br><br>بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا نازری ناوەخۆ ئەرکی پێ سپێردراوە، لە ٢ جەمادی یەکەم ١٣٣٦ و لە ١٤ شوبات ١٣٣٤.</td></tr>
</table>




DH.ŞFR.00083.00071.001

| DH.ŞFR. | 00083.00071 | 27 ڕەبیعی یەکەم 1336 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی فەرمانبەران و تۆماری کەسێتی
بەڕێوەبەرایەتی فەرمانگەی گشتی ناوەخۆ
٣١١٣١ گشتی
بۆ وەکالەتی ویلایەتی موسڵ
شیفرە
لە فەرمانبەران دوو، بۆ قائیمقامیەتی خیزان بە مووچەی چینی دووەم قائیمقامی سنجار خەیری بەگ بگوازرێتەوە، لە مێژووی ٥ کانوونی دووەم ١٣٣٤ فەرمانی پاشا فەرموویەتی، لە ١٠ کانوونی دووەم ١٣٣٤.
بە ناوی وەکیلی نازر

بۆ ویلایەتی موسڵ
شیفرە
قائیمقامی سنجار خەیری بەگ، بە موچەی چینی دووەم بگوازرێتەوە بۆ قائیمقامیەتی خیزان بۆ شوێن ئەویش قائیمقامی دهۆك مونیر بەگ، بۆ قائیمقامیەتی دهۆکیش قائیمقامی کۆی سانجەق نەسیب بەگ وەردەگیرێت، بەو مووچەی کە وەریدەگرن دەگوازرێنەوە، لە مێژووی ٥ کانوونی دووەم ١٣٣٤ فەرمانی پاشا فەرموویەتی، لە ١٠ کانوونی دووەم ١٣٣٤.
بە ناوی وەکیلی نازر



DH.ŞFR.00084.00027.001

<table>
<tr><td>DH.ŞFR.</td><td>00084.00027</td><td>27 رەبیعی کۆتایی 1336</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>بەڕێوەبەرایەتی تۆماری زانیاری و فەرمانبەران<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>شیفرە<br>فەرمانبەرانی ١٦، لە شیفرە مێژووی ٣١ کانوونی دووەم ١٣٣٤ ڕەزامەندی دراوە کە قائیمقامی گولعەنبەر سوڵتان ئەفەندی بۆ قائیمقامیەتی ساسۆن و نەشئەت بەگ بۆ قائیمقامیەتی کۆی سانجەق و مەسعود بەگ بۆ قائیمقامیەتی رواندز بگوازرێنەوە، حاڵی حازر بەهۆی ڕەسەنایەتی هیدایەت ئەفەندی لە گولعەنبەر دادەمەزرێت و نەشئەت بەگیش بەم زووانە بە بەرزبوونەوەی پلەکەی، گونجاو نییە دووبارە پلەکەی بەرز بێتەوە، لەو راپۆرتەی کە ئارەزووی کردووە هیدایەت ئەفەندی لە ناو ویلایەت لە ناحیەیەك دابمەزرێت و لە گولعەنبەر بە وەکالەت بەکار بهێنرێت، هەروەها لەبەر ئەوەی شوێنەکانی خەلەف و محەمەد ئەفەندی بەتاڵە، چاوەڕێی بریاری گۆرینەوەی شوێنەکانیان بکرێت، لە ٩ شوبات ١٣٣٤.<br>عەبدولخزر بە ناوی وەکیلی نازر</td></tr>
</table>




DH.ŞFR.00084.00098.001

| DH.ŞFR. | 00084.00098 | 8 جەمادی یەکەم 1336 |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی قەڵەمی فەرمانبەران
بۆ بریکاری ویلایەتی بەتلیس
شیفرە
فەرمانبەرانی ٧، بۆ قائیمقامیەتی ساسۆن بە مووچەی چینی یەکەم قائیمقامی گولعەنبەر سوڵتان ئەفەندی دادەمەزرێت، لە مێژووی ١٤ شوبات ١٣٣٤ فەرمانی پاشا فەرموویەتی.
شوبات ١٣٣٤
بە ناوی نازر

بۆ ویلایەتی موسڵ
شیفرە
فەرمانبەرانی ٢٣، بۆ قائیمقامیەتی ساسۆن قائیمقامی گولعەنبەر سوڵتان ئەفەندی بە مووچەی چینی یەکەم هەروەها بۆ قائیمقامیەتی کۆی سانجەق قائیمقامی رواندز نەشئەت بەگ بە مووچەی چینی دووەم دەگوازرێنەوە، بۆ قائیمقامیەتی رواندزیش بە مووچەی چینی دووەم قائیمقامی پێشووی زاخۆ مەسعود بەگ دادەمەزرێت، لە مێژووی ١٤ شوبات ١٣٣٤ فەرمانی پاشا فەرموویەتی، ١٩ شوبات ١٣٣٤.
بە ناوی نازر

BEO.004499.337354.001

| BEO. | 004499.337354 | 23 ڕەبیعی یەکەم 1336 |
|---|---|---|

٢٣ ڕەبیعی یەکەم ١٣٣٦
٧ کانوونی دووەم ١٣٣٤
بۆ وەکالەتی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
وەڵانی نووسراوی ٣ کانوونی دووەم ١٣٣٤ ژمارەی تایبەتی ١٠:
بۆ قائیمقامیەتی قەزای خیزان، قائیمقامی قەزای سنجار خەیری بەگ هەروەها بۆ قائیمقامیەتی قەزای سنجار، قائیمقامی دهۆك مونیر بەگ و بۆ قائیمقامیەتی قەزای دهۆکیش قائیمقامی کۆی سانجەق، نەسیب بەگ دامەزرێن، سەبارەت بە دامەزراندنیان بە ڕەزامەندی فەرمانی پاشای جەنابی پاشا فەرموویەتی وێنەی پەسەندکراوی هاوپێچ بۆ دەوڵەت نێردرا ئەفەندم.

٥ کانوونی دووەم ٣٣٤ لەسەر فەرمانی پاشا.

BEO.004503.337718.001

| BEO. | 004503.337718 | 4 جەمادی یەکەم 1336 |
| --- | --- | --- |

٤ جەمادی یەکەم ١٣٣٦
١٦ شوبات ١٣٣٤
بۆ بریکاری نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
وەڵامی نووسراوی ١٢ شوبات ١٣٣٤ ژمارە تایبەتی ١٤٦:
بـۆ قائیمقامیەتـی قـەزای ساسـۆن، قائیمقامـی قـەزای گولعەنبـەر سـوڵتان ئەفەنـدی هەروەهـا بـۆ قائیمقامیەتـی قـەزای کـۆی سـانجەق، قائیمقامـی قـەزای روانـدز نەشـئەت بـەگ و بـۆ شـوێنی ئەویـش قائیمقامـی پێشـووی قـەزای زاخـۆ مەسـعود بـەگ دامەزرێـن، سـەبارەت بـەم دامەزراندنـەش بـە رەزامەنـدی فەرمانـی پاشـای جەنابـی پاشـا فەرموویەتـی، وێنـەی پەسـەندکراوی هاوپێـچ بـۆ لایەنـی دەوڵـەت نێـردراوە ئەفەنـدم.

١٤ شوبات ٣٣٤ لەسەر فەرمانی پاشا.



BEO.004615.346071.001

| 18 جەمادی یەکەم 1338 | 004615.346071 | BEO. |
|---|---|---|

١٨ جەمادی یەکەم ١٣٣٨
٩ شوبات ١٣٣٦
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی بە وەکالەتی جەلیلە
وەڵامی نووسراوی مێژووی ٥ شوبات ١٣٣٦ ژمارە ٢٢٨، قائیمقامی قەزای حوسن مەنسور نازم بەگ دوورخراوەتەوە، لە شوێن ئەو قائیمقامی کۆی سانجەق نەشئەت بەگ دامەزرێت، بۆ رەزامەندی وێنەی پەسەندکراوی فەرمانی پاشای جەنابی پاشا هاوپێچ نێردراوە، بۆ جێبەجێ کردنی.